کورتە ڕۆمان

# ئافاتی
# ژن بردن بۆ مەسئولەکان

## سەرگوزشتەیەکە.. مێژوویەك لەڕابردوو.. پەندێك بۆ ئەمڕۆ

نوسینی

**شاخەوان عەلی حەمەد مامۆکی**

## (١)

(حەمەلاو) پیاوێکی هۆشمەند، بێ وەی و سەرو زمان شیرین، دەمێ بوو، لەدنیای بێقەراری خۆیا دەژیا. کەچاوە خەواڵوەکانی لە (هەڵۆ)بڕی، بە دەنگێکی باوێشکاویەوە)کوڕم هەڵۆ، ئەم هەویرە، ئاو دەکێشێ... چاك وایە ئارامت ببێ و لەگەڵیدا بگونجێی. ئێ خۆ ناکرێ هەموو ماڵمان لەبەر خوێندنی تۆ تێکدەین و ماڵمان ببەینە شار... حەز دەکەم، بزانم خراپەی سورمێ ی براژنت لەچیدایە؟!بۆچی بەو شێوەیە ڕقت لێیەتی؟!)).

(هەڵۆ)بۆ ئەو پرسیارە، وەك لەخەوێکی قورس، ڕاپچەنن، گشت هەستەکانی لە گوێ ی دا گرد کردەوە و ئاهێکی قووڵی هەڵکێشا: ((بابە گیان، کە زۆر هات، قەواڵە بەتاڵە... شتێ پیس و بۆگەن بوو، دەبێ تامی چی بێت؟! ئەو براژنەی من هیچی تێدا نەهێشتۆتەوە... کورددەڵێ :گەر شەڕت کرد بایی ئاشتی تێدا بهێڵەوە... دوو ساڵە دانم بەخۆم داگرتووە، ئەوەی پێموترا، لە ئاستی دا، قوڕ و کپ، قسەم نەکرد... بابە من لەخوێندنی شار... هەموو هەرایەکم بۆ ئەوەیە، بە نمرەیەکی باش پۆلی شەش ببڕم و لەکۆلێژێکی بەرز وەرگیرێم... تۆ، تا ئێستا ڕۆژێك لە ڕۆژان گوێت لە من بووە بە خراپە باسی ئەو براژنەی خۆم بکەم بلێم :ئا ئەوەیە کارو کردەوەی؟!هەر وتم:لەگەڵم باش دەبێ، بەڵام بێ سوودە... فەرموو، بیهێنە پێش چاوت، گەر لەجیاتی من ڕۆژانە لە گەرمەی خوێندن و خوێندنەوەدابی، کەچی لە ناکاو بە دەنگێکی قێزەوەن، وەك منداڵ بانگ بکرێی، بە نەڕاندن و بێبایەخەوە پارەت بۆ بەردەم فڕێدەندەی

برۆ ئەم شت و ئەو شتە بکڕە.. تۆ لەبەرامبەریدا هەڵوێستت چی دەبێ؟!.. هەموو کەس عیزەت و کەرامەتی خۆی خۆش دەوێ.. ئەوە بۆ دوو مانگ دەڕوا، پرتەو بۆڵەی تا دێ زیاد دەکا، ئەقڵی شتێ نەگرێ، کوڵی خۆی بە مناڵەکان دادەڕێژێ، ئەوجا چ قسەی خراپ و جوێن نامێنێ بەو برایەمی نەدا.. پێش هاتنەوەم دەرهەق بەو رەفتارە و هەڵسوکەوتەی، تەوژمی هەژان و تووڕە بوونێکی نامۆ لەدەرونمدا سەری هەڵدا... بە سەر سوڕمانەوە تێڕامام و سەرنجێکی خێرام دایە سەرو روخساری: (سورمێ.. لە پێش چاوی من دا جوێن دان بە باوك شتێکی جوان نیە). ئەویش وەکو گوێی بۆ قسەکانم ڕایەڵ کردبوو.. بە بێ ەنگ پاڵی بەدیوارەکە دادا و ماوەیەك خامۆش بوو، چاوی بەشوێنێکی نا دیار روو، کە رووی وەرچەرخاند، بەڕقەوە:( تۆ دەمت داخە، شەو ورۆژ بە سەر و گوێلاکمانی، مافی ئەوەت نیە قسە بخەیە قسەمانەوە). ئەوەش هەر هیچ، بابە گیان باوەڕت هەبێ، جار نیە لە گەڕانەوە دا بچمە ماڵیان و سەلام بکەم بە گەرمی بەخێرهاتنم بکا.. ئێ خۆ، باوەکوشتەی ئەو نیم، بەم جۆرە سەیرم دەکا.. فەرموو تۆ سەر پشکبە، گوناهی من، لەمانەدا چین؟!).

(حەمەلاو)واقی وڕما، بە حەپەساویەو: ) من نکۆڵیم لەوە دانیە، سورمێ شەرم لەبابی خۆی بکا.. خەتاکەش هەمووی لەئەستۆی مازنی براتە... لە ئەوەڵەوە بۆی داهێنا.. بۆی شلکرد، هەر باشە سواریشی نابێت.. باشە کورم بەڕای تۆ، چار چیە؟!).

که بۆ ماوەیـەکی کـورت، بێـدنگی قـووت دا، نـەیتوانی تـا سـەر، زمـانی گـرێ داتـەوە، هەڵێـدایێ (هـەلۆ، چ بـرادەرت نیـە، لەگـەڵیان رێکبکەوی و پێکەوە خانوەیەکی سەربەخۆ، بگرن؟!).

(هەلۆ)کەلیکی تووڕەیی بەلالغاوی دا، کـەفی چـەندبوو، بزەیـەکی خاوی، کەوتە سەر لێو: (منیش هەر ئەو قسەیەی تۆم مەبەست بـوو، بیکـەم.. هەڵبەتـە بـەم کـارە دەرفـەتێکی لـە بـارم لـە بەردەمـدا دەڕەخسـێ، تـا بەمێشـکێکی کـراوە، سـەعی بکـەم و دوا ڕۆژی ئاواتەکانم، بێنمە دی؟!).

(حەمەلاو) زەردەخەنەی هاتێ... دایە قاقای پێکـەنین، کەسـەری هەڵبڕی: (کوڕم ئامۆژگاریەك هەیە، دەبێ پێش وەخـت، بـەتۆی بڵـێم :تۆی قوتابی، ئامانجت خوێندن و سەرکەوتنە لە وانەکانت دا... بۆیە نامەوێ دوور و نزیك، دەم لەشتێ بدەی، ماڵوێرانی بەدواوەبێ ).

(هەلۆ) چاوی لێ نەتروکانـد و بـە پوزێکـەوە، پرسـی: (شـتی وەك چی؟!).

(حەمەلاو) وتی: (ژیانی شار، لەژیانی گوندی جیایە.. رژێم پیـاوی خـۆی بـە هـەموو کـەنج وکەلـە بەرێکـدا بـلاّوە پێکـردوە... کاریـان:چـاودێری خـەڵك و سـیخورێتیە بەسـەر ئـەم وئـەوەوە... هەڵبژاردنی هاورێ ی چاك، لـەگرفتت، دوور دەخاتـەوە و پاراسـتنی زمان، پاراستن بەخۆ دەدا،تۆ هێشتا منالّی، ئێمە لەوولاّتێکدا دەژین، هێزێکی سەرکوتکار وتۆقێنەر، مشورمان دەگێرێ.. بەهێز، بێهز تێـك دەشـکێنێ.. گـەورە، بچـوك هەڵدەلوشـێ... بـەس مـن دەزانم ئـەم رژێمەی بـەعس چ ڕژێمێکـە، شـۆڤێنیەکی ئـەو تـۆ:بـە خـوێنی کـورد

مەستن.. لەسەر ئاوازی دەستڕێژ سەما دەکەن و کەیف خۆشن، لەشین وزاری خەڵکی ڕەش و ڕووت و بێگوناهدا، ئارام وئاسودە خەویان لێدەکەوێ.. مەحمودی ولاشزاوام. یادی بەخێر.. جارێکیان میوانمان بوو.. یەخەی گرتم وتی:بۆ نایەی بتکەمە رەیس جاش؟! لە دایەرەی ئەمندا، کەس نیە نەیاناسم... وەرە بەس مۆری بکە وبلێ دەیکەم، ئەو سمێڵە لە پیاو نەهاتبێ، گەر هەر چی خەڵکی گوندیە، هەموویانت نەخەمە ڕوو. ئەوجا بەگاڵتە ئامێزەوە، وتی : (تۆ لە ئەیلوول دا، ئەوەندە ساڵە پێشمەرگە بووی، چیت بە چی کرد؟!من کە بیر لە وەزعی تۆ و مناڵەکانت دەکەمەوە، هیچتان لەماڵدا نیە، نەپارە ونە سەیارە، پەست و نیگەران دەبم ). منیش ڕەپ و راست، پێم وت : (بەندە لەو تەرحە پیاوانە نیە پەتپە تانێ بکا و هەر رۆژێ بەلایەك دا وەرسوڕێ و، بۆ پارە و پایە، خۆی بدۆڕێنێ). بەم قسەیە، قین لەچاوی دا، وەك هەورە بروسکەی بەهار، شریخەی دا: (هەی کەللە رەق.. من تۆ بناسم قەت پاك نابیەوە و تا خاوەنی ئەو بیر کردنەوە بی، نابی بە هیچ). زەردەخەنەیەکی گەشم بەو پەڕی ڕێزەوە : (فەرموو.. گەر تۆ خۆت بە خەمخۆرم دەزانی، ئەوە قوتابخانەیان لەم گوندە کردۆتەوە، هەوڵێکم بۆ بدە بە پاسەوان دامەزرێم ).

خۆڵەمێشی بنمیچەکە، تێکەلاوی چاوە ڕەش و هاشەکانی (هەلۆ)بوو بوو... لە ناخەوە دەکولاو گیانی هێنابووە جۆش و خرۆش : (بابە گیان : دەزانی ناتوانم قسە نەکەم؟!وەکو دەنوڕم، مارنی برام، ماوەیەکە بوەتە ئاشنای عەلە سەر بۆزو بەگەرمی هاتووچۆی

یەکدی دەکەن.. هاوڕێیکم، وەکو ڕالیدیتن دەربارەی عەلە سەر بۆز، دەیگێڕاوە، دەیوت :ئەو مەفرەزەی رژێم بە عەلە سەربۆزی داوە، گەر واسیتەو خۆشی ژنەکەی نەبووایە، چاوی پێ نەدەکەوت).

(ئامانج) بەجەستەیەکی شل و شۆق وماندو و شەکەتەوە، بە ژوور کەوت.. بەسەرسوڕمانەوە ن لەسیمای هەڵۆ وردبۆوە.. سەری بۆ قسەکانی لەقاند و دوو لێوی شکۆفەی، پشکووت: (عەلە سەربۆز کێ یە؟).

(حەمەلاو) هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا.. ئازاری پەنگخواردووی بە باداو سەرنجێکی خێرای دایە سەر ڕوخساری و هاتە گۆ: ( من تا ئێستا بچمی ئەو زەلامەم نەدیوە.. وەك چۆن بۆ هەڵۆیان گێڕاوەتەوە.. هاوڕێیەکی نزیکم، گێڕایەوە، دەیوت : عەلە سەربۆز، کابرایەکی سیسی رەقەڵەی کەڵەگەتە.. سێ ژنی هەیە... پێش وەرگرتنی ئەو پۆستەیە، دەبێتە بەعسی و بەشداری لە سەرجەم کۆڕ و کۆبونەوەکان دەکات... دەستێکی باڵای دەبێت لە خەبەردانی ئەو کەسانەی، فیرار یا کەس و کاریان پێشمەرگەبووە.. ڕۆژانە بە چاوێکی حیزەوە، دەچووە شوێنەقەرەباڵغیەکانی وەك چایخانەو گازینۆ و نادی و شوێنەکانی تر، گوێ قولاغ، هەستی رادەگرت و لەوە دەگەڕا، یەکێك لەفزێکی خراپی لە دەم بێتە دەرو قسەیەکی خراپ بکا، هەر زووبیکاتە راپۆرت و بۆ ئافەرینێك، تەسلیمی بکات... لەمنەزەمەوە بە تەلەفۆن بەرپرسی دایەرە کە ئاگادار دەکەنەوە کە لەمەودوا: عەلەسەربۆز، تەنها سەرە مانگ دەردەکەوێ، ئەویش بۆ وەرگرتنی موچەکەیی و هیچی تر.. دوایی ماوەیەك دەبێتە رەفیق حزبی و لە

داوەتێکی دایەرەی ئەمن بۆماڵەوەیان، کار بەدەستان سەریان سوڕ دەمێنێ کە لە هۆڵی پێشوازی دا ن دەنۆڕن ئەوەندەی وێنەی سەدام حوسێن لەو شوێنەدا هەڵواسراوە، لە هەموو دایەرەکەیان ئەوەندە وێنەیە بەدی ناکرێ... عەریزەیەك دەدا : (حزبی بەعسی ئیشتراکی، دایك و باوك و خوشك و برامە.. هەر چاوێکم ناپاکی لەم حیزبە بکا، دەریدێنم.. بەمەبەستی خزمەتی زیاتر، داواکارم لە بەرێزتان، لوتف بفەرموون بە رەزامەندی وەرگرتن بەوەی مەفرەزەیەکم پێ بدرێ ). بە نوسراوێك عەریزەکەی بۆ سەروو بەرز دەکرێتەوە... کاتێك مژدەی رەزامەندیەکەی پێ دەدەن، پێ ی دەڵێن لەو یەك دوو رۆژەدا لیستێکی سی کەسیمان بۆ بێنە، تا کاری لەسەر بکەین... عەلەسەربۆز، لەخۆشی دا پێی بەعاردی ناکەوێ.. بەنێو برا و ئامۆزا و برادەر و کەس و کاری دەگەڕێ... ئەوەندە ناوەی نووسی، نووسی. کەزانی سی ناوەکەی پێ خڕ نابێتەوە. بە هەڕەشەو گوڕەشە و چاو سوورکردنەوە، ناوەکان، تەواو دەکات، لیستەکە دەباتە منەزەمە وبەرپرسی منەزەمە، پێی دەڵێ : (ئەمشەو کاتژمێر نۆی ئێوارە تا دوانزەی شەو.. پێویستیم بەئافرەتێکە بۆمی بێنی... ئافرەتێکی وا، خۆت دەزانی چ ئافرەتێك بێ؟!). عەلەسەر بۆز، سووکە بزەیەکی بۆ دەخاتە سەر لێو وبەو پەڕی رێزەوە، پێ ی دەڵێ : (ئافرەت لەخزمەتدایە). عەلەسەر بۆز، بێ سڵکردنەوە، ئەو نهێنیە لای ناسیارێکی خۆی هەڵدەڕێژێ، کە ئەویش وەك هێلکەیەکی پاککراو، لە نوکەوە بۆی گێڕامەوە، وتی: (عەلەسەربۆز بێ شەرمانەبۆی باس کردم، وتی :دەمزانی ئەم داواکاریەی بەرپرسی

منەززەمـە، بـۆ تاقیکردنەوەیـە، بزانـێ تـا چـەند لـەژێر فەرمایشـتی دادەبم.. دیارە نەناردنی ئەو ژنەی داوای کردبـوو، بـە هـەر پاسـاو و بیانویەك بووایە، ئیلغای ئەمرەکەیان دەکـردم... منـیش ناچـار مـام، ژنی خۆمیان بۆبنێرم ) عوسمانە رەشەی دراوسێی ماڵە پوورم، ئەوێ رۆژێ، نـازانم لەچـیەوە، بـاس هاتــە سـەر عەلەسـەر بـۆز، وتــی: (ڕووداوێکی ئەو کابرایە دەزانم، گەر بە ئامانەتی دەگری، ئەوە بۆتی دەگێڕمــەوە دەنــە خــۆم تووشــی دەردە ســەری ناکــەم )،منــیش بەبزەیەکەوە وتم: (دیارە هێشتا منت نەناسیوە ).

ئەویش جگەرەیەکی ئاگردا، قومێکی قووڵی لەجگەرەکەی دەستی داو دووکەڵەکـەش. وەك هـەوری بـەفر، بەسـەر دەمـو وچـاوی بـەرز دەبـۆوە، تـووڕی دا: (ئێوارەیـەکیان لەسـەر نـان خـواردن بـووم.. عەلەسەربۆز تەلەفۆنی بۆ کردم کە سەعات نۆی ئێوارە بە چارەگێك، بـەخۆ و سـەیارەوە لـەپێش ماڵیـان ئامـادەبم.. منـیش نـەك لەبـەر خۆشی، بەڵکو لەترسی ئەوەی نەوەکو بەڵایـەکم بەسـەر دابێنـێ،وتم: ٠باشە بەسەر چاو). لـەکاتی خۆیـدا، بەسـەیارەوە چـوومە بـەر دەم ماڵیان، ژنـی بچـوکی عەلەسـەربۆز (سـۆزان)ی نـاوە.. چ سـۆزان؟ ! ئـافرەتێکی چـاو شـینەی پـرچ زەرد، لەگـەڵ مانگـدا شـەڕ دەکـات.. سۆزان برایەکی راکردووی دەبێ.. نیوەڕۆیەکیان کت و پـڕ لـە لایـەن مەفرەزەیـەکی ئەمنـەوە، بەسـەریان دادەدەن و راپێچـی دەکـەن.. کــەس و کــاری، شــوێن نامێنــێ، ســەری پێــدا نــەگرن.. جێگــە نامینێسەحی نەکەنەوە... لێپرسراو نامینـێ، لەبـەری نەپاڕێنـەوە و پارەیەکی زۆری نەخەنەقورگەوە.. هیچیان بەدەستەوە نامێنێ، ئـەو

کـەل وپەلـەی بەکـەڵك هـات فرۆشـتیان.. کاتـێ ڕوو لەعەلەسـەربۆز دەنێن، پێیان دەڵێ : (من لەپارە، بـێ پـارە نـیم.. زانیومـە کچێکی جوانتـان هەیـە نـاوی سـۆزانە.. ئەگـەر ئامـادەن، لێمـی مـارە کـەن، بەڵێنتان پێدەدەم ئەو کوڕەی ئێـوە، لـەژێر سـێدارەش بـێ، بۆتـانی ئازاد بکـەم ) وەك بـاس دەکـەن، دوای گواسـتنەوەی سـۆزان، زۆری ئەملا و ئەلا کرد... دوا وەلاّم پێی دەڵێن : (چ خۆت مانـدوو مەکـە.. ئەو کوڕەی تۆ هەوڵی بەردانی دەدەیت، سێ چوار ڕۆژە رمی کراوە ) بەهــەر حــالّ نــازانم، عەلەســەربۆز چــۆن و بــەچ شــێوەیەك، تــوانی قەناعەت بەو ژنـە بێنـێ، بەقسـەی خـۆش، تـەماح، رشـاندنی پـارەو پــولێکی زۆر و زەبــەن یــا بــە هەڕەشــە و چاوســورکردنەوە، تــا فەرمانەکەی رەت نەکرێتـەوە ئـەو سـێ سـەعاتە بەرگـەیان بگـرێ... دەسـتم بـە پلاکـی ماڵـەوەیان نـا.. عەلەسـەربۆز لـەوە دەچـوو، زوو هــــەموو رێــــو شــــوێنێکی رەوانــــەکردنی ســــۆزانی ئامادەکردبــــێ، بەچاوپێکەوتنم، وتی :(باش بـوو لـەکاتی خۆیـدا هـاتی.. ئـافرەتێکم لەلایە، دەیبەیە لای رائید کیفاح.. ئەوەی قسەیە، لەگەڵ ئەو ئافرەتە دا نایکەی و بێ دەنگ تەسلیی، دەکەی وپـێ ی دەڵـێ ی : (سـەعات دوانزە دێمەوە بە دوایـا). کیفـاح :زەلامێکـی رەشـتاڵەی سـەر گڤنـی لـووت فشـی ورگـزل، لـچ و لێـوێکی ئەسـتووری هەیـە، بەڕەچـەڵەك :عەرەب و خەڵکی پارێزگای تکریـت بـۆ زیـاتر لـە دەسـاڵە، لەناوچـە جیاجیاکانی کوردسـتاندا ژیـاوە و کوردیـەکی بـاش دەزانـێ.. سـەرم بۆعەلەسەربۆز بادا: (باشە بەسەر چاو ). رووی وەرگێڕاو بانگی کرد : (وەرە ئــافرەت وەرە ســوار بــە). ئافرەتەکـە بـەبێ دەنگـی هاتــە

دەرەوە.. کەڵەگەتە، جل و بەرگێکی رەش، دەم وچاوی دەمامك درا بوو.. لە چاوەی دواوەی سەیارەکە داسوار بوو، لـەرێگادا وردە وردە دەکۆخی، هەر بەو کۆخەیەی زانیم ئەوە سۆزانە چونکە بەدەیەهاجار ن لـەبازاڕ گەیاندومەتـە مـاڵ و بەپێچـەوانە.. ئـەو وشـکە کۆخەیـەی لێیەتی، لە یەکێك دەکا، دووچاری نەخۆشی سیل بـوو بـێ.. سـۆزان زیـاتر لـە چـوار سـاڵە لـەلای عەلەسـەربۆزە، منـاڵی نابـێ.. دەڵـێن: نەزۆکە.. منیش باوەڕم وایە.. عەلەسەربۆز لەهەڵبـژاردنی ئـەو ژنـەی دا، زیرەکانە بڕیاری داوە، کەهەر شتێك ڕوویدا، ئاو لەکابرای عەرەب نـاگرێ.. گەیاندمــە پێشــی منەزەمەکــە و رائیــد کیفــاح بــەتۆی تراکسۆتێکی شینەوە، لەبەر قاپیەکە، لەسەر کورسیەك دانیشتبوو.. پێ لەسەر پێ، چـاوەڕوانی ئێمـەی دەکـرد. سـۆزان دابـەزی، نرائیـد کیفاح، بەزەردەخەنەیەکەوە، وتی: (دوای سێ سەعاتی تـر، دێیـەوە ئێرە.. ئێستا بەخێر چی). سەیارەکەم لا کردەوە، تیلەم دایێ، ئەوە کیفاح دەستی خستۆتە ناو قەدی سۆزان و هێدی هێدی بۆ سەرەوەی دەبـا.. سـەعات دوانـزە، هاتمـەوە دوای، پـاش چـاوەڕوانی تاوێـك، هەردوکیان دەرکەوتن. سۆزان لە بەرامبەر ئەو رابواردنەی پێیکرابوو، وەك زۆر ئەزیەتدرابێ، خاو وخلیچـك، شـل و شـۆق هـەنگاوی دەنـا.. لەهەمان چاوەی دواوە، سوار بۆوە، رائیـد کیفـاح بـە کەیفسـازیەوە، وتـی: (سوپاسی من بـۆ ئـەو دەعوەتـە، بـە عـەلی بگەیـەنن). سـۆزانم گەیاندوە بەر قاپی حەوشە.. عەلەسەربۆز لەبەر دەرگا وەستا بـوو.. سۆزان بە هێمنی دابەزی و بەدەم قوڵپی گریانـەوە، چـووەوە ژورێ.

ئەویش هەر نەیهێناو نەیبرد، وتی: (سوپاسی ئەو ماندوو بونەت دەکەم، خوا حافین).

جوڵەم پێکەوت. گۆمی هەستم پەنگاوەی داو بە نیمچە حەپەساویەکەوە : (پەکو هەقی کرێیەکەم نادەیتێ؟!). سەرنجێکی ووردی دامێ و بزەیەکی پڕ لە شانازی بەروو دادام : (ها نەخەڵەتێی جارێکی تر هەڵەی وا بکەی.. تۆ بەکرێ ئیشم بۆ دەکەی؟! ئەی نازانی لەبەیانیەوە، من ئامر مەفرەزمە و ئیشت دەکەوێتە لام... دەی خواحافیزت بێ ). ڕووی وەرچەرخاند، بە چەند هەنگاوێکی گورچ و گۆڵ، چووەوە ژورێ و دەرگاکەی لەسەر داخستم.. منیش بەدڵی شکاوەوە، ئەو شوێنەم جێهێشت و لەبەر خۆوە، جوێن نەما.. قسەی ناشیرین نەما، ئاڕاستەی نەکەم ).

(هەڵۆ) بزەیەك بە ڕووی دالکا لەو جۆرە بزانەی بەماناوە، روو دەگرن : (بابە، من وەك زانیومە عەلەسەربۆز، لەماوەیەکی کەم، بوەتە خاوەنی چەندین ریزە دوکان و سەیارەی دوا مۆدیل و خانووی سێ نهۆمی وئێستا خاوەنی چوار ژنە.. دەڵێن : یەکێ لە سیفەتە فرچك پێ گرتوەکانی، ئەوەیە، شەو نیە تەشقەڵە بەماڵە دەوڵەمەندەکان نەکا و مەفرەزەیان نەنێرێتە سەر.. وایشی لە دارو دەستەکەی گەیاندووە لەو چالاکیانە، بۆ ناو زڕاندنی پێشمەرگە.. خۆیان وانیشاندەن کە پێشمەرگەنە و ڕاو و رووتی خەڵکی دەکەن.. ئەوەش هەر هیچ، دەڵێن : رق و کینە لە هەر یەکێ هەڵگرێت، هەزارو یەك بیانوو ناوناتۆرەی لێ دەنێ و دەینێتە داوێکەوە، دەربازبوونی مەحاڵ بێ.. کاکڵی قسان :بابە گیان، مارنی برام هەر مانگێك دەبێ

ڕۆژێکیـان، عەلەسـەربۆزی داوەتکـرد.. دوای نـان و چـاخواردنەوە، بەوگوێیانەی خۆم، گوێم لەپرسیارێکی مازن بـوو.. بەشـەوقەوە لێـی پرسی : (ئەرێ، پێم بلێ تۆ چۆن لەپڕێك دا بووی بەو کوڕە؟!پێمانی بلـێ :بـا ئێمـەش، ئـەو ڕێیـە بگرینـە بـەر؟!). عەلەسـەربۆز یـش، بەتەوسەوە وتی: (بۆگەیشتن بەو پلەو پایە، بەو سەروەت وسامانە، لـەزانیاری کۆکردنـەوە لەسـەر خـەڵك، دەسـتم پێکـردووە و دواتـر هەمیشە ماستاو کردن، پاشان لەڕێی ژنەوە گەیشتووم بـەم ئاسـتە.. زۆر بـرادەرم هەیـە، چ جـای ئـەوەی فەرمانبـەرێکی ئاسـایی میرین، کەچی لەبوونیان بـە ڕەفیـق حیزبـی، دەڵـێن: لەسـایەی حکومـەت و حزبی بەعس، وەزعمان زۆر باشە و لە هیچمان کەم نیە )مازنی بـرام، چی پێبلێ باشە؟!بەبزەیەکەوە، وتی: (دەنەکاکە عەلی من زۆر حـەز دەکـەم دەوڵەمەنـدبم.. دەبزانـە قـەت هاوکاریـەکم ناکـەی و ڕێ وشوێنێکم بۆدانانێی؟!). عەلەسەربۆز بەپێکەنینەوە پێی وت: (گـەر خۆت لەگێلی نەدەی، تێ دەگەی، گەیشتن بەو ئاواتە لەچ ڕێیەکـەوە دەستە بەر دەبێ ). تەنانەت زۆر جار هەستم ڕاگرتوە، ئەوە سورمێ ی بـراژنم، لەگـەڵ مـازن دا پرتـە و بۆڵـە بۆڵیـەتی، پـێ ی دەڵـێ : ( بۆخـۆت لەگـەڵ ئـەم ئەمنانـە نـاگونجێنی؟! چـیبکەم پیـاو نـیم و ناگەمەلایان، ئەگینا دەمزانی چی دەکەم؟! بەڵام من تاخاوەنی تـۆبم ئەمەیە بەشم دەبێ بەعەزرەت هەموو شتێکەوە بمرم).

(سورمێ) ناو قەد باریکی کەمەر تەنگ ژنێکە : جوانی ونازداری لێ دەباری وبەچەشنی گوڵی بەهار کراوەتەوە.. دڵڕفێنێکی دڵبەندکەرە،

دووچـاوی ڕەشــی پرشـنگداری گـەورە، بـەتیری، دڵـی هـەزاران لاو، بریندار دەکا.

(ئامـانج) بەهێمنیـەوە : (ئـێ بابـە گیـان، تـا ئـەو برایـەمانی، لەخشتەنەبردووە، بۆ ناچی سەردانیەکی بکەی و لەنزیکەوە ڕێنمـایی بکەیت). (حەمەلاو) چاوە نەرمەخەواڵوەکانی، ساچمەی توڕییان فڕێ دا: (جا مازن منالّە من بچم گوێ ی بگرم و ئامۆژگاری بکەم؟!).

(خەجیج): پێست گەنم ڕەنگ، دوو زولفی سـپی شـین بـاوی درێـژ بـەلا جـانگی بـەردابۆوە، ڕوو لۆچـاوی، چـاوزیت بـوو.. ئـەو قـاوەی نابوویە سـەر ئاگرەکـە، لەهەڵچـونی دا، ئاگرەکـەی کـز کـرد و چـوار فنجانەی پڕ لەقاوەی خەستی تێکرد و هێنای لەبەر دەمـی دانـاین... فنجانەیەکی لـەپێش خـۆی داخسـت و ورد ورد سـەرنجی لێ دەگـرت. (حەمەلاو) لەسەرخۆ قاوەکەی فڕ کرد.

(هەلۆ) هەڵیدایێ : (مازن، نەسیحەتی کەس وەرنـاگرێ.. پەسـتر پێرێ، ویستم هەنـدێ قسـەی لـەو بابەتـە لەگـەڵ دا بکـەم، چـاوێکی هیلاکی خەواڵوی پێمـا گێـڕاو، کەسـەری بـێ بڕوایـی ڕاوەشـاند، پـێم هەڵشاخا، وتی: (من خۆم بەدەردی بابم نابەم ودوای کـلاوی بـابردوو ناکەوم.. ئەو لەشەست و یەکەوە تا شۆڕش تاوایەوە، کردی وکۆشـا، فــەرموو کــوا ســەیارەی بــەردەمی؟کوا خــانووی پــڕ و پــوختی؟! حەزدەکەم بزانم لەو هەموو ماوە درێژەدا، چی بەچی کرد؟!ئێستاش ئـەو پەتایـەی پێیـەوە دەتلێینـەوە، درێـژەی ئـەو پەتایەیـە، کەلـە باوکمانەوە بۆمان بە جێ ماوە؟!).

(حەمــەلاو) ســەری وەکــو لــووتی عەلەشــیش، بەســەر کۆشــیدا شۆڕکردەوە.. بۆماوەیەك تاسـا، کـە زمـانی گەڕانـد: (مـازن شـەکری خوارد و ناماقوڵی کرد.. من تاپێشمەرگە بووم، بەپیاوانەکردم و لێ ی پەشیمان نیم.. تا ئەو رۆحەی منـیش مابـێ، خـەیاڵیان خـاوە : بچـم بۆئەو رژێمە مۆر بکەم میللەتەکەم قڕ بکاوبیچەوسێنێتەوە.. شوکر تا ئێستا، دەستم لەکـەس پـان نەکردۆتـەوە، مـرۆڤیش دەبـێ غیرەتـی لەلەش دابێ، خۆشی ژیان شەرەفی لێ نەسێنێ ).

لەسەرخۆ، هەڵسایە سەر پێ.. لەنزیکی پەنجەرەکە، کەوتەسەیری شــەین وشــەپۆڕی لقــە دارتووەکــەی خــوارەوە، کەبــە دەســت بــاوە زولاڵەتی بوو.

(هەڵۆ) ئێوارەی ڕۆژی هەینی، گەڕایەوە شار و چەند ڕۆژێك لەماڵی مـازنی بـرای مایـەوە.. نیوەڕۆیـەکیان، خـۆر تـازە ڕێگـاو بـانی، داخ دەکرد... بەئەسپایی هەرچی کەل وپەلێکی هەیبوو، پێچایەوە.

(مـازن)بـەو دیمەنـە، شـپرزە بـوو: (هـا هـەڵۆ، ناکـا بتـەوێ ئێـرە جێبێڵی؟! چما دەڕۆی جێمان دێڵی؟!).

(هەڵۆ)بەدەم بزەیەکی مەغزاوە(کاکە گیـان، ئـەوەی راسـتی بـێ، لەگەڵ دوو هاوڕێ وهاپۆلمـدا، ڕێـك کـەوتووین، خانوێکمـان لـەنزیکی قوتابخانەکەمان بەکرێ گرتووە ).

(سورمێ ) ڕووی گرژ کـردو بەتاڵیـەوە نەڕانـدی : (جـا، مـازن تـۆ بۆڕێ ی لێ دەگری؟!دیارە کابرا شوێنێکی لێرە باشتری دۆزیوەتەوە ).

(هەڵۆ)وەك بەزەیی بەحاڵی خۆیا بێتەوە، لەتاوا، لچی دەلـەرزی و هەنسـك ڕێگـای قسـەکردنی لێ دەبـڕی، تـوانی هێـواش هێـواش بـەدەنگێکی لەرزۆکـەوە، بڵـێ: (مـن ئـەوە چـەند سـاڵی رەبەقـە، خزمەتتان کردووم، مەمنوونم.. لەمە زیاتر ویژدانم ئاسودە نابێ، ببمە بارگرانی وئەرك بەسەرتانەوە).

(سورمێ ). چاوی لەگرێژنە چوو:( زۆر خۆشە.. مـرۆڤ هەسـت بـە دەردو مەینەتی و ئازارەکانی بەرامبەری بکات).

(مـازن) توڕەییـەکی شـاراوە، لەچـاوەهێمنەکانی، بریسـکەی دا.. شـڵەژا، وەك تونـد قورگیـان گرتبـێ، هەناسـەی سـوار بـوو.. بـەدەم پاڕانەوە : (ئافرەت ڕجاتلێدەکەم، دەستم دامێنت ئەوە قسە نیە تـۆ

دەیکەی؟!هـەلۆ گیـان هـەر پێویسـتیەکت هـەبوو، مـاڵ مـاڵی خۆتـە ئیشەڵڵا سەرت لێ نابڕم ).

(سـورمێ )گوێچـکەکانی لێ قـووت کردبـۆوە.. بەمۆنیـەوە، هــەر چاوێکی کردە دووچاو و بڕیە دەم وزاری، لە پـڕ هـاواری لێ هەڵسـا : (مـن چ خراپەیـەکم دەرهـەقی نـەکردووە، تـا بیکـا بـەترِ و منـەت بەسەرما).

(هەلۆ)تەکسیەکی ڕاگرت.. ( مازن)لەگـەڵی دا، کەوتەکێشـانەوەی کـەل و پەلـەکانی.. هـەلۆپێش ڕۆیشـتن، بەکزۆڵیـەوە، ڕوویتێکـردن: (دوعاتان دەخوازم.. بمێنن بەخێر).

(سورمێ )سرك بوو.

(مازن)لەناخەوە، بۆی سووتا: (بەخێرچی برا شیرنەکەم).

**********

(هەلۆ) بەدیـدەنی برادەرەکـانی خۆشـحاڵ بـوو.. بەمـە بـوارێکی چاکی لەبەردەم ڕەخسا تـا بـەرێك و پێکـی بخوێنـێ و لـەو لاوە دڵـی مامۆستایەکان، بەلای خـۆی ڕاکێشـێ.. زۆرجـار کەبەتـەنیا دەمـاوە، لەبەر خۆیەوە، دەیوت: (بلێ بۆ زوو نەهاتمە ئێرە؟!نە تـڕو منـەت.. نەپرتــەو بۆڵــەی بــراژن.. نەئەوەنـدە خــەمم دەخـوارد.. ئـەو سـەر ئێشەیەشم، یۆ دروست نەدەبوو.. بەڕاستی غـەدرێکی گـەورەم کـرد، ئەو هەموو ماوە درێژە، چومە ماڵیان).

لەبەرنامەی خۆپیشاندانێکی جەماوەری بەر فراواندا، هەلۆ یەك لەو پێشـەنگ و پێشـرەوانە بـوو.. لەگـەلچ دابـارین و خزانـە نێـو بـازار و

شەقامەکان و ناو شار کەوتە هوتاف کێشان : (بژی هێزی پێشمەرگە، سەدام نزیکی مەرگە) (ئێمە کە خوێندکارانین داواکاری ئازادین).

شار خروشا، تانك و زریپۆشەکانی سوپا، ئابلۆقەی ئەو دەورو بەریان دا و بێ رەحمانە کەوتنە تەقە.. ئەوی کەوتە بەر دەست، بەسەرو دەم و چاوی شکاوەوە، ڕەوانەی گرتووخانە کرا.

(هەڵۆ)دوای خۆقوتارکردن، گەڕاوە ئەو خانووەی، بەکرێ ی گرتبوو.. دواتر بەسەعاتێك، لەلایەن مەفرەزەیەکەوە، ئابلۆقەی خانووەکە دراونە بێجامەی بەریەوە، پێشیاندا

(هەلۆ )پاش ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر، ئازاد کرا.. گەڕاوە ماڵ.. (خەجیج)بەبینینی، فرمێسکی شادی لەچاوەکانی دا رێچکەی بەست و بەسـۆزەوە، باوەشـی پێـدا کـرد.. نوسـاندیە سـینگی و بەگەشکەداریەوە : (وای کارمـامزە جوانەکـەم :ئۆخـەی، وا ئـەمجارە نـەمردم و چـاوم بەچـاوت کەوتـەوە). (حەمـەلاو) ئـەملاو ئـەولای روومەتی ماچ کرد.. ئەویش پـەلاماری دەستی ڕاستەی داو کەوتـە، ماچ کردنی.

(هەلۆ)لەشەوێکی هێمن وئارام لەبەردەم ئەو خزمانـەی، هاتبوونـە سەردانی.. بەدەم هەنسکدانەوە، کەفرمێسك بـەری چاوی تـەنیبوو، وتـی: (لـەو ماوەیـەدا، ئـەو ڕوداوانـەی هـەر گیزلـەیاد نـاکرێن.. یـەك لەوانـە: (رنجـدەر)ی خـۆڕاگر بـوو.. نـاوبراو سەرپەرشـتی چـەند شـانەیەکی نهێنـی نـاو شـاری دەکـرد، کەتائێسـتاش، نـەمزانی ئەوکابرایە.. پارتیە.. یـەکێتی یـە.. یا شـوعی.. یا سۆشیالیست.. چەند بـەیان نامەیـەکی لـەماڵ دا لێ دەگـرن، ئەوەنـدە دەیخەنـە بـن زەبروو زەنگی ئەشکەنجەدان.. نەدرکاندنی بچوکترین زانیاری وبـیر و باوەڕەکـەی پەشـیمانی ناکاتـەوە.. بـەو چـاوانە بینـیم چـۆن لەناوەراستی گۆڕەپـانی گرتووخانەکـە راگـیراو چۆ ن چوار چـەکدار سەریان لێگرتوو گولله بارانیان کرد، کەتا ئەو ساتەش زەردەخەنـە، بەسـەر لێویـەوە بـوو.. ئـەو شـەوەی فـەرمانی کوشـتنی دەرچـوو.. هـەمووومان بـە قـوڕگی پـڕ لـە گریانـەوە هەسـتمان لەچـرپەو هـەر

هەناسەیەکی گرتبوو کەلەگەرویەوە دەردەچوو، وتـی: (جـەلادەکان، دوو ژوریان نیشاندام.. ژورێکیان تابلۆ ی خۆش ورازاوە.. ئافرەتێکی ڕووت و قووت لەسەر زگ راکشابوو پەنجەی شـایەتمانی بـۆ جولانـدم وەك ئاماژەیــەك پــێم بلــێ : (وەرە وەرە بــۆ ئــەو نــاز و نیعمەتــە )ژورەکەی دیکـەیان سـەراپای سـور، بـەخوێنی کـوڕە کـورد ڕەنگـی گرتبوو، وتیان :(ژیان خۆشە.. خـۆت سـەر پشـك بکـە لەهەڵبـژاردنی یەك لەم دوو ڕێگایە)وتم: (ئاگام لەهیچ نیە). هیچ شـتێکم نەدرکانـد.. ڕۆژی پاشـتر، بردرامــە ژورێکــی تاکــە نەفــەری.. ئــەوەی چـاوەڕوانم نەدەکرد ڕوویدا.. خێزانەکـەمیان لـە ماڵـەوەهێنا بـوو.. ئەفسـەرەکە بەبزەیەکــەوە، چـاوی تێــبڕیم : (هــا.. ئێســتا بچــیەوە نـاو مـاڵ و مناڵەکەت، لەناو کـەس و کـاری خـۆت بـژێ ی باشـتر و خۆشـتر نیـە لەوەی هەموو لەشت لە ژێر دارو سۆندەدا بڕزێ؟!دەی ئیعتراف کـە) هــەر نکـۆڵیم کـرد ونەچـوومە ژێـر بـارەوە.. ئەفسـەرەکەی ڕویکـردە جــەلادەکان و بەســەر بادانــەوە : (دەی جلــەکانی بــەری ئــەو ژنــە و خۆشتان پانتۆڵەکانی بەرتان داکەنن ) قیژەی خێزانەکەم ڕۆژە ڕێیەك دەڕۆیی.. فرمێسـك لـە چـاوی نەدەوەسـتا.. ئـاگرم تێبـەربوو حـەزم دەکـرد ببوومایەتــە دڵۆپــە ئاوێـك و بــەناخی زەویـدا ڕۆ بچـومایە.. هەمدیس ئەفسەرەکە ڕووی تێکردم: (ها.. حەز دەکـەی خێزانەکـەت لــە پــێش چـاوت ئــەتك بکـرێ و ئــەو دوو زەلامــە سـواری بـن.. یـا ڕاستیەکانمان پێ دەڵێـی؟! ). وتم: (بـەس حـەیا و ناموسـم مەبـەن، چـی دەڵـێن : وەلامتــان دەدەمــەوە.. هــەر لــەو ماوەیــەدا ئــەوەی ئاشنایەتیم لەگەڵیدا پەیدا کرد.. (دیار) ناوێك بـوو.. گـەنجێکی تـازە

هەڵچوی تەمەن بیست و یەكساڵە.. گەنم ڕەنگی بالاَ بەرز، لاوێکی تا بڵی ی شەنگ و هەر پێوانەیەك بۆ جوانی سەرو سیما و ڕێك و پێکی ئەندامانی لەشی پیاوێك دابنرێت، لەودا هەبوو.. ئەو لەگەڵ ئاشکرا بوونی ئەو هێڵە نهێنیەی کاری حیزبی تێدا ئەنجام دەدا.. قوتابخانە جێ دێلێ و بەڕاکە ڕاك، دەچێتە گوندەلایان خۆر : تازە ماڵئاوایی دەکرد. (مەلا عومەر) ی بەرپرسەکەیان بە کارێکی زۆر تایبەت دێتە لای و رایدەسپێرێ کە سبەینێ بچێتە ئەو گوندەلایان و بەرەوەیان.. لەگەڵ تاریك و ڕوون دا هێشتا خۆر لە دەم کەلەوە هەڵنەهاتبوو.. بە وەلاَشی دوو هاوبیری گوندەکەیان بەرەو ئەو شوێنە بەڕێ دەکەوێ و لە دووڕییانی ئەو سەورە ڕێیەدا دەکەونە نێو بۆسەیەکی قایم و تۆکمە کە هەلاَتن و دەرباز بوون تیایدا ئەستەم بوو.. لێیان لێ دەخوڕن:(کوڕە نەجوڵێن تا لەت و پەتمان نەکردوون). چوار دەوریان تەوق دەکرێ.. کەڵەپچەیان دەکەن و بە پشتێنی قەدیان چاویان دەبەستنەوە.. دەیانخەنە چاوەی لاندکرۆزێکی سپی و ئەملاو ئەولایان بە دوو زەلامی

چوارشانەی ناقۆلاَو زەبەلاح ئابلووقە دەدرێ و بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی هەولێریان دەبەن.. ترس و بیم، ئەندێشەیان بەرەو دەیەها جیهانی سەیرو نامۆ هەڵدەفڕێنێ.. دڵتەنگ و خەمناك. (دیار) لە ناخەوە دەڵێ : (دەبێ کێ خەبەری لێدابین؟! چۆن زانیان بەو بەرە بەیانیە بەرەو ئەو گوندە دەڕۆین؟! بەڕاستی مایەی سەر سوڕمانە). ئەو فڕێدەدرێتە، ژووری ژمارە یەك.. مەلای شێوان بانگ دەدا دەیبەنە ژووری لێکۆڵینەوە، لەوێ دوو چەکداری پانتۆڵ و

کراسلەبەری کەتە، لوولەی تفەنگەکـەنیان بـۆ خـوار شـۆڕ کردبـۆوە، دەستیان لەسەر پالاپیتکەی تفەنگەکەنیان بوو.. بە پێـوە پرسـیاری ناوی باوکی لێدەکەن.. ئەویش تف لە قورگی دا وشك بوو بوو.. هـەر هاتە سەر زاری وتبووی :(باوکم، ناوی حەمە ڕەشـیدە). جـەلادەکان بە شەق و پێلەقە بەربوونە وێزەی.. بە لێـدان و کوتـان بردرایـە ژێـر زەمینێکی وا، تاریکی و سامناکیەکی بێ سنووری لە باوەش گرتبوو.

(دیـار) بۆمـانی گێڕایـەوە، ووتـی: (ژێـر زەمینەکـە، رووناکیـەکی مەیلەو پەمەیی لە خۆ گرتبوو.. تەڕو شێدار.. بۆن و بەرامەی هالاْوی خـوێنی، لێـدەهات.. لەسـەر کورسـیەکیان دانـام و لـە دواوە تونـد دەسـتمیان بـە کەلەپچـە لـە بوتڵـە غازێـك شـەتەکدا، تـا لـە هـەر جوڵەیەکی بوتڵە غازەکە بە ئاگا بێن.. خەمبارو پەشۆکاو لە دونیـای کپ و خامۆشی دا پشیم دەخواردەوە.. شتەکانی ئەو دەورووبەرە بۆ خۆی کارەسـاتێك بـوو.. دا چـەمامەوە، بـە کـلاْوەی چۆکم، نـەختێ پەرۆکەی بەر دیدەم لادا.. بەسڵەمینەوە یەکی سامناك و هۆشیارانە، تەماشای شتەکانم کرد، لەسەر زەویەکەچەند پارچە سۆندەو کێبـڵ و تاك تاك پێلاْوی جۆراو جۆری لێ کەوتبوو وێڕای کنـدڕێکی ئەسـتوورو قایمی بنمیچی ژێر زەمینەکە.. ئاوڕێکی بەپەلـەم دایـەوە.. کابرایـەك لەسەر رۆخی مەرگ، لە گیانەلاْنا بوو : لەڕو لاوازو رەنگ زەردە.. دوو چـاوی زەق، لـوتێکی نووکتیـژی چـنگاڵ.. دوو رووومــەتی قوپــاو، تێکسمڕای گەردەڵە بوو.. جل و بەرگەکـەی بـەری، شـاتاڵ شـاتاڵ.. لەسەر دۆشەکێکی تەنك و لەسـەر زگ کـەوتبوو.. جەسـتەی شـەلاڵی خوێن، نەمزانی چۆن وبە چ شێوەیەك بیدوێنم؟! بێ دەنگیەکی تاڵ،

باڵی بەسەردا کێشابوو.. نرکەو ناڵەیێکی لێ هەڵسا کە کت و مت لە سەمفۆنیایەکی هەست بزوێنی دەکرد.. بە سۆزەوە پرسیم : (کاکە.. کاکە.. ئەوە لەسەر چی، گیراوی؟!). کابرا وەڵامی نەبوو.. لێم دووبارە کردەوە : (کاکە.. کاکە.. ئەوە لەسەر چی، گیراوی؟!). بە دەم دەنگێکی لەرزۆك و کزەوە: (من ناوم جەلالە.. خەڵکی لای مەخمورم). ئیتر لرخە لرخێکی لێوە هات و نرکەو ناڵەی بڕا.. کاتێك جەلادەکان دابەزین، لە دوورەوە پۆستاڵی پێیان جیڕە جیڕی لێدەهات، مەلی خەیاڵم هەڵفڕی.. ڕاڕایی و دوو دڵیەکی زۆر دایگرتم.. لە بوتڵە غازەکەیان کردمەوە.. لە پشتەوە بە چوار جەلاد، کندڕێکی ئەستووریان لە دەستم گرێ دا و هەڵیانواسیم.. ئینجا ئەو جل و بەرگەی پۆشیبووم، لەبەریان داکەندم و لە کارەبایان دام.. پاشان بە کیبلێ و سۆندە وەرگەڕانە سەرم و ئەو حاڵە تە دووبارە دەبۆوە

هەر (دیار) گێڕایەوە، ووتی: (گیراوەکان بەبێ ڕەچاو کردنی بیرو باوەڕی سیاسی.. یەکتریان خۆشدەویست و ئەو پەڕی هاوکاری یەکدیان دەکرد.. ئەمە لە کاتێك دایە،لە ناوچە ئازاد کراوەکان شەڕێکی گەرم و گوڕی برا کوژی لە ئارادایە.. ئەو تەباییەش لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە ڕژێم هەمووانی بە یەك چاو سەیر دەکرد.. زۆرلەئەفسەرەکانی ئێشکگر بە دەستی ئەنقەست و بۆ کات ڕابواردنی خۆیان و لەولاوە وەکو ئازاردانێکی ڕاستەوخۆی دەروونیمان، کە دەهاتنە ژوورەوە بە پێ ی ئەو ڕاپۆرتانەی لەبەر دەستیان بوو.. دەیانزانی کێ شوعیە؟ کێ یەکێتیە؟ کێ پارتیە؟! چەپڵەی لێدەداو دەیووت:(دەی بتانبینم و نەتانناسمەوە : یەڵە دەی، کێ شوعی یە؟

کـێ یەکێتیـە؟ بـا هەڵسـێ). ئـەوجا بـە دەم هـاوار کردنـەوە، دەیووت:(یەڵە دەی، لە یەکدەن.. تف لـە یەکدی بکـەن.. جنێـو بـە سەرکردە حیزبیەکانتان بدەن) ئەگەر بە قایمی لـە یـەکیان نەدایـە.. یەکسەر بانگی جەلادەکانی دەکردو دەیووت:(وەرن، لەشـی ئەوانـەم بۆ نەرمکەن؟!). جـێ ی سـەرنجە، دوای دەرچـوونی ئەفسـەرەکە.. هەردوو هەڤاڵی بە شەڕ هاتوو، بە دەم قوڵپی گریانەوە، ئامێزیان بـۆ یەکتر دەکردەوە و دەستیان بە گریان دەکرد.. ئەمەش لـە ڕوانگـەی لاوازی و بێهەڵوێستی نەبوو.. هەر هەموویان خەڵکی قارەمان و گیـان لەسەر دەست بوون.. ڕۆژێکیان ناویان خوێندمەوە بـە هەڵپەیەکـەوە هەڵسام.. بە ڕوویـەکی خۆشـەوە سلاویان کـردو ووتیـان:(فـەرموو.. قوربان، جەنابی بەڕێوەبەر، حەز دەکـا بتبینـێ؟!) سەرسـام بـووم، باوەڕم بە خـۆم نـەکرد، ووتم : (دەبـێ دونیـا نـەگۆڕابێ؟!) جیـا لـە جـاران، چـاویان نەبەسـتمەوە کەلەپچـەیان نـەکردم و نەشـەق و نەپێلاقە، لێیاننەدام.. خودی بەڕێوەبەر، یەکەمجاریش بوو بمبینێ.. لەبەرم هەڵسا.. زۆری ڕێز لێنام.. ئاوێکی ساردیان دامێ.. هەر خۆی، جگەرەیەکی سۆمەری بولغـاری بـۆ ڕاگـرتم. ئـەوجا بـەدەم بزەیـەکی کراوەوە، ووتی:(من تـۆم خـۆش دەوێ.. ئاگـادارم ماوەیـەکی زۆرە، لێرە میوانی منی و دەشزانم جەنابتان چەند برات موخـەڕبین و ڕۆڵـی بەر پرسیاریان هەیە.. حەز دەکەم : چ لە ناو شار، یا لە چوونە شاخ هاوکاریمـان بکـەی، چـی دەڵـێ ی بـۆتی دەکـەین.. ئێسـتاش بـە سەیارەی خۆم، بۆماڵی خۆتانت دەنێرمەوە). منیش خۆم بە لایەکی دی بـرد.. ووتم:(ببـوورە نـاتوانم هـیچ بکـەم.. چـونکە قوتـابیم، لـە

سیاسەت کارم نـەکردووە، هـیچ شـتێك لـە ئـەلف و بـیٚ ی سیاسـەت نازانم). پاش هەندیٚ گفتوگۆی زیاتر، تا بتوانیٚ قەناعەتم پـیٚ بێنـیٚ.. زانی هیچم لیٚ هەڵناکرِیٚ.. زەنگەکەی لێدا.. جەلادێك هاتـە ژوورەوە، پێی ووت:(دەی.. تێیهەڵدەن.. فەلاقەی کەن). هەر ئەوەندەم ئاگا لە خۆ بوو، بە سیٚ چوار جـەلادە کەوتنـە سـەرم.. ئاگـام لـە خـۆ بـرِا.. کاتێك بە هۆش خۆم هاتمـەوە، ئـەوە لـە ژوورێکـی تـاك نەفـەری دا، کەوتووم).

بابە گیان:

بـە هەڵواسـین دەسـتەکانمان سـرِ دەبـوون. بـە کلـۆجیٚ : وامـان هەسـت کـرد دەسـتمان لـە لاشـەمان جیابۆتـەوە.. بـە دار و کێبـلٚ، لاقمانیانـدەکوتا.. لاقمـان هەڵدەئاوسـا.. ناخۆشـترین کـات : ئـەو دەمەیە چل پەنجا گیراو لە ژوورێکی سیٚ بـە چـوار.. نووسـتنمان بـە نۆبە دەبوو بۆ ماوەیەك نیوەمان بنوین و نیوەکەی دی لەو ماوەیەدا، بە پێوە بوەستن.. تەنانەت لە ژەمەکانی خواردن.. سەرو سەمونێکی رِەق و تەق و خواردنێکی بێلەزەت و بێتامیـان دەداینـیٚ.. سـەرەرِای ئەوەی خواردنەکە، بە پێنج شەش بەند کراو، لە قاپێکی فافۆنی زۆر بچووك بوو کە بەشی تەنها کەسێکیشی نـەدەکرد، هەنـدیٚ جـار بـرِیٚ نـەوتیان تێـدەکرد.. ئێوارەیـەکی درەنـگ نـاوی ژمارەیـەکمان بـۆ دادگـایکردنی شـۆرِش، خوێندرایـەوە.. بـوو بـە ئاهـەنگ و خۆشـی و شادی.. دەست گوشین.. یەکتر ماچـکردن و گـەردن ئـازادی.. مـن و دوان لەوانــەی لــە رِۆژی خۆپیشــاندانەکە لــە پێشــەوە هوتافمــان دەکێشــا.. هێشــتا بــەر نــەدرابووین، بردراینــە ژووری یــەك لــە

ئەفسەرەکانی ئەو دەزگایە و دکتۆرێکی لە لابوو.. ئەفسەرەکە ووتی:(ئێوە بە فەرمانێکی سەرکردایەتی ئازاد دەکرێن.. بۆ ئەوەی پەند لە ڕابردووتان وەرگرن، دەبێ سەرو دەرزیتان لێبدرێ.. دەرزی دووبارە نەکردنەوەی هەڵەکان). سەرو دەرزیان لێداین و بە خۆشحاڵیەوە، بەڕێیان کردین).

بە درێژا، کاریگەری دەرزیەکە وایکرد (هەڵۆ) تەنها دوو مانگ و سێ ڕۆژ بژێ.. لەو ماوەیەدا بێتاقەت، زوو زوو قورگی ووشك دەبوو.. خەوزڕانێکی قووڵ، هەستی بە خەمۆکی دەکرد و تێنوو، خواردنی پێنەدەخوراو ووزەو توانای ڕۆیشتنی نەما.. قاچەکانی دەلەرزی و لە دووی نەدەچوو، پێڵووی چاوی سپی داگەڕا.. سیس و لاواز، رەق وەك کۆتەرە.. جگە لە ئێسقان، ووردە ووردە گۆشتی جەستەی بە جارێ تاواوە.. سەرەنجام لە نیوە شەوێکی خامۆش دا بە یەکجاری چاوەکانی لێکنا.. قیژە قیژو هات و هاوارێك.. دەنگی فیزاح و چریکەی (خەجیج)، ئاوایی هێنایە هەژان. خەڵکەکە راچەنی، ئەو خەڵکەی، لە ماڵەوە ڕاکشابوو.. ئەو خەڵکەی نوستبوو. بە پەلە پوزێ خۆی دەگۆڕێ و بەرەو ماڵی (حەمەلاو) هەنگاوی دەنێ.. چیە؟! چیبووە؟! (هەڵۆ) وەفاتی کرد.. چەند پیاوێکی بە تەمەن لە ناو هەیوانی مزگەوت خڕبۆوە، یەکێ ئاوی دێناو دەیخستە مەنجەڵی کورەوە.. یەکێك پرێمزی پڕ لە نەوت دەکردو گەرمی دادێنا.. سێ کەسی دیکەیان پێش شۆرینی تەرمی (هەڵۆ)، لە بەر ڕۆشنایی چراکان دا ئەو پارچە خامەی هێنابوویان، کەوتنە بڕین و دوورینی.. کوڕ گەلی ئاوایش هەریەکە دەستی دابووە بێڵ و قازمە و بەرەو گۆڕستان ملیدەنا، کە ئاوەکە گەرم بوو تەرمەکەیان لە سەر تاتە شۆرەکە دانا، شوشتیان.. کفنیان کردەبەر مەلا لەسەری دا کەوتە قورئان خوێندن.. چوارەم زەلام، دارە مەیتەکەیان نایە سەر شان و بەرەو قەبرستانیان برد.. نوێژی مردوویان لەسەری دابەستا.. پاشان

تەرمەکەیان لە سەر تەنیشت، بۆ ناو گۆڕۆچکە شۆڕکردەوە.. بە ئەلحەد دایانپۆشی.. ئەو قوڕە خەستەی گیرابۆوە، دەرزەکانیان پێ سواق دا.. بە بێڵ، خۆڵەکەیان نایەوە سەری، دووکێڵیان لەم بەرو ئەو بەری چەقاند.. دوو گەنج دەستی یەکیان گرت و خۆڵەکەیان پەستاوە، دوای تەلقین و نزاو پاڕانەوە و خوێندنی فاتیحا، خەڵکەکە گەڕانەوە، لە ئێوارە عەسری سێیەم ڕۆژی تازیەکەدا، (حەمەلاو) بە غەمبارییەوە لە سەر ئەو مافوور ڕاکشا بوو کە کاتی خۆی (خەجیج) چنیبووی... چاوی بڕیە (مازن) و(ئامانج) و زاری دەمی گەڕاند: ( کورم ئەو ڕژێمە میکرۆبە.. پەتایە، تا خاوەنی ڕژێمێکی وابین، مەحاڵە کەس لە دەست و زوبانی دڵنیا بێ).

(مازن) لێوی وشکی بەسەری زمانی تەڕ کردو دەستی بە سمێڵ ڕەشی زلی داهێنا : (باوکە گیان، نکۆڵی لە قسەکانت ناکرێ.. بەلاّم ئەگەر تۆ دەم لە سیاسەت نەدەی، چما حکومەت شێت و دڕندەیە لە چت و خۆڕایی پەلامارتدا و تەشقەڵەت پێبکا؟!)).

(حەمەلاو) چاو ئەبڵەق، بە مرچ و مۆنییەوە : ((لە بێ خەبەران، کەشکەك سەلاّوات.. کورم تۆ هێشتا منالّی و نازانی ئەو زولّم و زۆرداریەی لەو میللەت ڕەش و ڕووتە دەکرێ، چەند بە سوێیە؟! لەو ڕوانگەوە حەز دەکەم فریو نەدرێی و خۆت بە دۆڕاندن نەدەیت).

(مازن) زەردەخەنەیەکی نیوە مردو لێوی قەڵشان: (لە مەبەستت ناگەم).

(حەمەلاو) دەماری لاملی وەکو جۆگەیەك ئاوی پیادا بڕوا، ئاو سابوو، بە نەرمیەکەوە : ((گەر خۆت لە خوا نەکەی، تێ دەگەی

وحاڵی دەبی مەبەستم چی یەو چی دەڵێم؟! کورِم سیاسەت پیاوی ڕۆژە، ئەوەش سەنگی مەحەکە بۆ هەر شتێ کە ئێمە بیری لێ بکەینەوە، ئێستا تێگەیشتی چی دەڵێم؟!)).

(مازن) سەری لەبەر خۆناو بەنا بەدڵیەوە ووتی: (باوابێ).

وەرز: بەهارێکی درەنگ بوو.. رائید (کیفاح) سەردانی فەرمانگەی تووتنی کرد، کە تیاید (مازن) بەرپرسی هۆبەی مەلەفاتە.. لە کۆبوونەوەیەکی فراوانی سەرجەم کارمەندان دا، بە پۆزێکەوە، ووتی:((ئەمڕۆ لە سایەی حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی دا خەڵك ئاسوودە و بەختیار دەژیٚ، ئەو حزبەی جیاوازی لە نێوان کوردو عەرەب ناکاو هەر لە زاخۆ تا فاو بە یەکچاو سەیریان دەکات، بە پێوەرێکی وا ڕێزی یەکێك لە یەکێکی دی زیاترە کە بتوانیٚ خزمەتی زیاتری ئەم حزبەو لەو ڕێگەوە خزمەتی میللەتەکەی بکات.. ئەو هێمنی و ئارامیەی باڵی بەسەر ولاٚتەکەماندا کێشاوە، ئەگەر لێرەو لەویٚ تێکدەر و یاخیبوان پشێویەك دروست دەکەن دڵنیا بن ڕۆژیٚ دادیٚ دەستی عەدالەتیان بگاتیٚ و لە ڕەگەوە تۆیان ببڕین.. هەر لەم ڕووەوە، پێمان خۆشە پەیوەندی بەم حزبەوە بکەن.. ئەم حزبە حزبی خۆتانە، هەر کەسیٚ دەیەویٚ ببیٚ بە بەعسی، ئێمە سوپاسی دەکەین )).

(مازن) وەك دەمیٚ لە چاوەڕوانی فرسەتێکی وادا بگەڕیٚ، بزەیەکی سادەبە، سەر لێوەکانی دەگەڕیٚ و بە نزاکەتەوە، هەڵدەستیٚ:((قوربان حەز دەکەم ببم بە حزبی و بەڵێنتان پیٚ دەدەم ئەو ئەرکەی پێمی دەسپێرن، بە ئەمانەتەوە جیٚ بە جیٚ ی بکەم)).

دوای ئەو، یەك دوویەکی تر هەمان ئامادەگی خۆیان دەربڕی. رائید (کیفاح) بە هەڵپەیەکەوە رووی تیٚ کردن: ( سوپاسی ئەو هەڵوێستەتان دەکەین.. ئومێدەوارین نموونەتان زۆر بیٚ، هەر بۆیە،

ئێوە دەتوانن بێنە مونەززەمە و پێش پڕکردنەوەی فۆڕمی هاتنە ڕیز، چاومان بە یەگدی دەکەوێ و قسەو باسی خۆمان لەوێ دا تەواو دەکەین).

(مازن) لەو ڕۆژەوە، بە راپۆرتی تایبەتی ولە ناردنی بچوکترین زانیاری لە سەر جم و جۆڵی خەڵکی گەڕەك، ڕائید (کیفاح) ی لێ ئاگادار دەکاتەوە.. هەر کۆڕو کۆبوونەوەیەك ئەنجام بدرایە، دەبوو بە چارەگێ نیو سەعات پێش خەڵکەکە لەوێ بایەو ئەگەر لە ڕێزی پێشەوە دانەنیشتایە، وایدەزانی گوناهێکی گەورەی کردووە.. لە والاّ بوونی دەرگای گفتو گۆکان، دیسان دەبوو دەست هەڵبڕێ و گەر بۆ تاوێکی کورتیشبایە، بکەوێتە ماستاوساردکردنەوەو پیا هەڵگۆتن بە شان و باڵی بەعس و ئەو ئارامیەی خەڵك لە ژێر سێبەری دا دەژیٚ. ڕۆژێکیان ڕائید (کیفاح) لە منەزەمەوە تەلەفۆن بۆ بەڕێوەبەری فەرمانگەکەیان دەکات کە دەم و دەست ڕێ بە (مازن) بدرێ سەردانیان بکات: (مازن) خۆی دەگەیەنەتە مونەززەمە و.. وێرای پێشوازییەکی گەرم.. پیرۆزبایی بوونی بە ڕەفیق حزبی ئاڕاستە دەکات. بەم هەواڵە خۆشیەکی بێ سنوور، گەماڕۆی دا.. گەشگە گرتی و کاتێك گەڕایەوە ماڵ و پێ ی نایە حەوشە، لە دوورەوە هاواری کرد : (( هۆ گیانەکەم سورمێ.. سورمێ گیان مژدە مژدە، وا لەسایەی خواو هاندانی بەردەوامی تۆ کە هەمیشە پێت دەوتم ئەو خەڵکە چی دەکا، تۆش وەکو وانبەو خۆت پێ بگەینە.. ئەمڕۆ فەرمانم بە (ڕەفیق) دەرچوو.. دڵنیابە لەمەو دوا باری گوزەرانمان بەرەو پێش دەچێ)).

(سـورمێ) بـەم هەواڵـە دەمـی بەشـبۆوە، بەزەردەخەنەیـەکی مـەکراوی: ((چـی ی؟! چـۆۆن؟! بەڕاسـتتە؟! دەك پیرۆزتبـێ بـە سەرو دڵێکی خۆش، پیرۆزە)).

لێـی نزیـك بـۆوە.. ئـەویش بـۆن و بەرامـەی ئـەوی هەڵمـژی و بـۆ حەسـانەوە وپشـودان وئـارامی دەرونیـان چـوونە ژوری نوسـتن ولەنگەریان گرت.

(سورمێ) چاوی لە چاوی بڕی، دەستی کردە پێکەنین و تریقاوە بەدەم تریفەوە، قژە ڕەشەکەی بەدوا دا کەواند.. بە زمـانی لـووس و دەنگـی ناسـکەوە : ((گیانەکـەم.. دەبـێ لەمـەوپاش، لەگـەڵ دوا پێشهاتەکان زیرەکانـە مامەڵـە بکـەیت.. دەزانـی قـەت نرخـی تـەواو نەدەبوو ئەگـەر بتوانیبایـە پولێـك بـە مودیرەکەتـەوە بنـێ ی، چ بـە دەرکردن یا لێخستن یا بە خانەنشـینی.. ئـا، بـیرم کەوتـەوە، چۆنە داوەتێکی رائید (کیفاح) بکەین؟!)).

(مازن) هەناسەیەکی هەڵکێشا:(( منیش هەمان بیکردنـەوەم لـە لا گەلاڵە بووە، بـەڵام چـۆن و کـەی؟! خـۆت دەزانـی هێشـتا مووچـەم وەرنەگرتووە )).

(سـورمێ) سـەنگی قسـەی لـە سـینگی گـیر کـردو لەسـەری ڕۆیشـت:((مـن نـاڵێم دەم و دەسـت.. کـەی مووچـەت وەرگـرت ئـەو کاتە)).

(مازن) بەزەردەخەنەیەکـەوە:(( هـەر وا دەکـەم، بـەڵام بتبیـنم و نەتناسمـەوە.. بتبیـنم چـۆن پێشـوازی دەکـەی؟! چـۆن سـەرنجی

**رادەکێشی؟! ئەوجا بۆ سەرە داوی مەسەلەی مودیری، چۆن و بە چ شێوەیەك ئەو باسەی لەگەڵ دەکەیەوە؟! خۆت سەر پشکبە)).**

(مازن) بەیانی ڕۆژی پاشتر کە لـە خـەو هەڵسـا.. چووە بـەردەم دەست شۆرەکە و بە سابوونی لۆکس کـەفی سـابوونەکەی لـە دەم و چاوی سووی. بەچەند شڵپە شڵپێ ئـاوی پڕژانـدیّ و بەشـتە ماڵەکـە، سڕیەوە.. دەستی گەیاندە شەیەکەو لە بـەردەم ئاوێنەکـەدا دەسـتی بە شانەکردنی قژی کرد و بە مووکێش ئـەو تاڵـە مـووە سـپیانەی لـە سمێڵی پەیدا ببوو، دەمیّ بوو ئاوەژووی کردبـوو سـەرنجی ڕاکێشـا.. دەمی مووکێشەکەی لەبەر ناو هەموانی لە بن و بۆتکـەوە دەرهێنـا و بـە حـەزو ئـارەزوێکی بـیّ سـنوور، چـووە دەرەوە، کـە گەیشـتە فەرمانگەکـە و مـژدەی خـۆی ڕاگەیانـد.. هـەموو بـە جـاریّ هاتنـە پیرۆزبایی.. هەندێکیان بە تاسوقەوە : ((دەك لەسەر خێریّ، پیرۆزە، گەر شتێك هاتە پێشیّ و لێمان عاسیّ بوو، هـا، خۆتمـان لیّ نـەگۆڕی، نەکەی پشتمان تێبکەی بلّیّ ی ناتانناسم

ئێوە کێن؟!)).

(مازن) بەو پەڕی باوەڕ بە خۆبوونەوە :((هەی لە منتان نەکەویّ، دەلّیّ ی تا ئێستا، منتان نەناسیوە؟! من هەر مازنەکەی جارانم)).

**********

لەگەلّ وەرگرتنی مووچەی سەرە مانگ، رووی کـردە بەڕێوەبـەرو بە زەردەیەکەوە :((قوربان دەبیّ بڕۆم، نـەختێکی تـر، کۆبوونـەوەم هەیە)).

بەڕێوەبـەر، وەك ئـاگری ئاوپێـداکراوی لێهـات.. دۆش دامـا، کـە سەری هەڵبڕی : ((نا.. کاکە مازن، بـۆ کـاری کۆبوونـەوە و شـتی وا، پێویست بە پرسکردن ناکا)).

+ سوپاس

– سوپاسـی پێنـاویَ، ئـەو ئیشـانەی تـۆ لـە دەرەوە دەیکـەی، درێژەپێدەری هەمان ئەو خزمەتەیە، کە لێرە دەیکەیت

بە هەنگاو هەڵێنانەوەیـەکی هـێمن و لەسـەرخۆ، چـووە لای رائیـد (کیفـاح) و هـەر بـە پێـوە : ((گـەورەم بـە پەلـەم، لـە دابـین کردنـی کەرەسـتەو پێداویسـتی میوانـداری.. دەبـیَ ئـەمڕۆ ئێـوارە بێیـە میوانیم)).

رائیـد (کیفـاح) زەردەخەنەیـەکی سـووك، پەڕیـە سـەر لێـوی.. دەستێکی بۆ بن هەنگڵی بـردو خورانـدی : (( ئـاخر رەفیـق مـازن، چ پێویست بەو ئەزیەتە ناکا.. زەحمەتە)).

(مـازن) لێـوی بـە دەمـا بـرد :((نـا، گـەورەم چـی دەکـەم تـا ئەزیەتبیَ؟! ئەو گرینگیەی جـەنابتان بـە منـی داوە، بـە هـیچ شـتیَ قەرەبۆ ناکرێتەوە )).

رائید (کیفاح) بە زەوقەوە :((ئەو پلەی بـە تـۆ دراوە، شایسـتەو قابیلتە.. یەکیَ دڵسۆز بیَ و خزمەت بە حزبمان بگەیەنیَ، ئیشی ئێمە چیە گەر نەتوانین ببینە هاندەر و پشتیوانی )).

+ زۆر سوپاسی ئەو هەستە جوانەت دەکەم.. بەڵام چاوەڕوانم.

– باشە بەسەرچاو.

+ گەر ڕوخسەت بیَ.. بە یارمەتیت.

– بەخێرچی.

**********

بەرەو بازار شۆڕبۆوە.. زەلامێکی خڕە، تەسبیحێکی سەدو یەك دەنکی بەدەستەوە بوو، بە جادەی کۆلآنەکەیان داغلٚ دەبۆوە.. مازن هەرچی پێداویستی مێواندارى هەبوو، کڕی و گەڕاوە.. بە بیبینی سورمیٚ، بە شەوقەوە پرسی :((ئافرەت حازری؟! دەست و بازووت ببینم)).

(سورمیٚ) بادامە لێوی لە ڕووی چەقاند و خێسەیەکی لێکرد :((هیچ خەمت نەبیٚ.. بە دلٚی تۆ دەبیٚ.. ئەوجا ببینە، چۆن بە لەنجەو لار.. بە چاوانم.. بە هەلٚسووکەوتوو ڕەفتارم، دەستەمۆی دەکەم.. بیرم لێکردۆتەوە کە دوای نان خواردن ئەو فرسەتە وەربگرم و بیقۆزمەوە، ئینجا مەسەلەکەی لەگەلٚدا یەکلا دەکەمەوە.. بەلاٚم پێش وەختە داواکارییەکم هەیە؟!)).

+ هەر داوا کاریەك؟!.

(سورمیٚ) بەشەوقەوە :((دەمەویٚ دوای ئەوە، زێڕو زەبەنێکی باشم لە گوارەو ئەنگوستیلەو بازن و گۆبەند بۆ بکڕی)).

+ وەی بەسەر هۆردووچاو.. ئەمە هەر داوا نیە، خوای بکردایە لەم کارەدا سەرکەوتنمان بە دەست دێنا.. بلٚیٚ : ڕووح، پێشکەشتی دەکەم.

(سورمێ) گۆشتەکەی وورد کرد، لە ناو مەنجەڵێکی گەورە نایە سەر ئاگرو بە پاگژی کەورو کەرەوزو تەڕەتیزەکەی بژار کرد.. جوان و بە جیا، هەر یەکە لە ترێ و خەیاروقەیسی و هەڵوژەکەی شووشتەوە و بە پەڕۆیەکی خاوێن و تەڕ، مۆزەکانی سڕیەوە، چ جای ئامادەکردنی بیبسی قووتی و تورابی.. ئێوارە : سفرە خوانی ڕاخست و بە ڕێك و پێکی شتەکانی لەسەر دانا.

(مازن) لە حەوشەکەو لە چاوەڕوانی رائید (کیفاح)، دەهات و دەچوو.. لە کوژانەوەی کت و پڕی کارەبا دا، بێ ئۆقرەیی لێ تکا، بەڕقەوە هەنگاویناو چووە هۆڵەکە، دەستی بۆ تەلەفۆنەکە بردو لە دەم و گوێچکەی نزیکردەوە: ((ئەلۆ)).

- ئەلۆ

+ دایەرەی کارەبایە؟!

- بەڵێ.. بەڕێزتان؟!

+ تۆ کێ ی؟!

- عومەرە زل

+ کاکە عومەر : تو شەڕەف و ویژدانتان، ئەوە وەختە کارەباتان کوژاندۆتەوە؟!.

- من ناتناسم.. تۆ کێ ی؟!.

+ رەفیق (مازن).

- ببورە قوربان.. لە لای ئێمە هیچ خەلەلێك بەدی ناکرێ، تا بەو هۆیەوە، کارەباتان بکوژێتەوە.

+ دەی.. هەر ئێستە، بە پەلەو بێ دواکەوتن دەگەیەجێ و چارەی ئەو کارەبایەم بۆ دەکەن.

- هەر ئێستە دەگەمە لات، باشە.. بەسەرچاو.

(مازن) خێسەیەکی لێ کردو بە توندی تەلەفۆنەکەی لەسەر داخست.

(عومەرە زل) ئەو کەسەی لێ ی ڕاببینیایە، دەیوت :((چوومە ماڵیان.. چاوم بەسەر وێنەکانی سەر دیواریان گێڕا، تاسام.. مازن پەنجەکانی وەك ئاشقەو ماشقە لە یەك ئاڵابوون، یەکتریان دەگەوزاندو ئازارەکانیان بەش دەکرد.. بەبینینی من، لێوی لەرزۆکی بەسەرم هەڵشاخاند:(توو شەڕەفت، ئەوە ئیشە ئێوە دەیکەن؟!)وەڵامم نەداوە.. کەوتمە جووڵە.. بەرەو سەرچاوەی دابەشکردنەکە چووم.. هەر بە ڕێوە لاچاوێکم خەواندە ژووری ناندین.. چ ببینم؟! مێزێکی گەورەو ڕازاوە، ئەوەی دڵ دەیخوازێ، لەسەری بوو.. بۆ دۆزینەوەی خەلەلەکە، چەند شوێن و جێگەیەکم پشکنی.. بە ڕێکەوت سەرم هەڵبڕی،عەیب نەبێ تەماشا دەکەم ئەوە ژنەکەی مازن بە کراسێکی تەنکی نوستنەوە.. کراسەکەی لە بەر تەنکی بە لەشیەوە نوسابوو، لەبەردەم ئاوێنەیەکی دوو مەتری پڕ بە بەژن و باڵای دا، خەریکی ڕێکخستنی سەرو قژی بوو.. لەشەرمان یەکسەر سەرم داخست. دوای تەواو بوونی کارەکەو گەڕانەوەی کارەبا.. مازن لە جیاتی سوپاس وپاداشت.. پێمی وت: با بۆتان لە ناو یەك نانی گەرم بمێنێ )).

(سورمێ) پێدەچوو، پێخۆشحاڵبێ بەوەی ئەم ڕازو نهێنیانە، لە دڵی دا وەدەرنێ و وەك شانازی بە خۆوە بکا و پاڵەوانیەتیەکی مەزنی نواندبێ، شتێکی باوە لە دانیشتنی ژنانی گەڕەك لە پێش قاپی دا، هەرچی قسەیەك هەیە بۆ یەکی باس دەکەن هەر لە نانخواردنەوە بگرە تاچوونە سەر جێ و چۆنیەتی جووتبونیان لەگەڵ پیاوەکانیان.. ئەویش بە خۆ تەسك کردنەوە، دەڵێ :(( پیاوەکەم زۆر نابا.. هەر لەو ماوەیە دەبێتە بەرێوەبەری تووتن.. بە ڕاستی کارم کردو توانیم بە دەعوەت و فاولێك، هەموو شتێك بۆ پیاوەکەم فەراهەم و مەیسەر بکەم.. پیرێ ئێوارە رائید (کیفاح) مان بە خۆشترین و نایابترین خواردن و خواردنەوە، داوەت کرد، ئارایشتی خۆم کردو خۆشترین بۆنم لە خۆدا، کە دەستیان گەیاندە نانەکە سەرەتا لە پشت رائید کیفاح وەستام و داچەمامەوە، خۆم لە شانی خشاند، گوایە خەریکم خواردنی بۆ دەخەمە ناو فەخفوری و ئاوی لە بەردەم دادەنێم، ئینجا سوڕامەوە، ئەوجارە لە بەرامبەری وەستام.. چاوم لێ کەلا نەخست و چاوم نەگواستەوە، ئەویش جار جار، سەری هەڵدەبڕی و سەیرێکی دەکردم، کە دەیدی چاوی لێناتروکێنم، زوو زوو بەدەم خواردنەوە بەقوڵی تێمڕادەماو ئەوجا سەری دادەخست یا لەگەڵ دەدوا.. زەردەخەنەی سەیر کردنم، پەردەی لە ڕووی بیری دا، هەڵماڵیبوو.. ئەو کابرایە لە تاوا ئێستاش نەیزانی چۆن نانەکەی خوارد؟!. پێش وەختە، لەگەڵ مازن ئەوەمان بڕاندبۆوە کە بۆ سەرە داوی مەسەلەی مودیری، ئەو درەنگ دەست هەڵگرێ و خۆی دوابخات، ئیتر لەوەوە من دەست بە پیلانەکە بکەم.. رائید (کیفاح)

دەستی هەڵگرت.. منیش بە شەرم و نازێکی پڕ لە درۆوە :(فەرموو.. فــەرموو).. بــەرەو دەســت شــۆرەکە، پێشــی کــەوتم.. خــاولیم بەدەســتەوە گرتبــوو.. دواتــر خاولیەکــەم بــۆی ڕاگــرت :(فــەرموو قوربــان.. ئــەریێ قوربــان دەکــریێ لــە ژووری ســەرەوە، بــۆ تاوێــك بەیەکەوە دانیشین؟!) ئەویش وەك بە ئاواتەوە بیێ، لیکاوی لـە دەم کەفی چەند :(باشە، بەسەرچاو فەرموو) نیو سـەعات دوو بـە دوو لـە ژووری نوستن دانیشـتین.. بـوونی مـازن بـە بەڕێوەبـەری تـوتنم پـیێ ڕاگەیاند، ووتی :(لە بەر خاتری تۆو ئەو چاوە جوانانـەت، بـا سـبەی مـازن عەریزەیـەك بنووسـیێ و بێتـەلام، دەم و دەسـت نوسـراوی بـۆ دەکەین هەر چەندە ئەو مودیرەش سەر بەخۆمانە).

کاتیێ ژنەکان، بە تەوسەوە لێیان پرسی :(باشە سورمیێ خان، ئەو مەسئولانە زۆر بیێ شەرم و چاوە ڕوون لەهیچ ناگەڕێنەوە.. خۆ رائید (کیفاح) هیچی لیێ نەکرد ی).

(سورمیێ) بە شانازیکردنەوە،وەك لەشەرم داماڵـدرابیێ، هەڵێدایـە : (بەدی چۆن؟! لاتـان وایـە، مـرۆڤ لـە بـەر دەسـتی ئـەو مەسـئولانە، واسووك و سانا قوتاری دەبیێ؟! بە تایبەت بۆ ئیشـێك، بڕیارەکـە لـە دەست ئەوان بیێ؟! لێتانی ناشارمەوە، باوەشی پێداکر دم.. خـەریك بوو ئاگری ئارەزووەکانی خۆش دەکرد خێرا نرکە ونالّەیەکم لـەخۆوە هەڵساند وەکو ئازارم هەبیێ بەمە بەو نرکە ونالّـە یـە خـۆم لەدەسـتی قوتارکرد ئەوە بوو سستیەکی کـت و پـڕ دایگـرت بـە سسـتی لەسـەر سیسەمەکە ڕاست بۆوە و چووە وە خواریێ ).

(مازن) هەر ئـەو ئێـوارە، عەریزەیـەکی، بـە وشـەی قەبـە قەبـە و بریقدار ڕازاندەوە.. بەیانی پێشکەشی کـرد.. رائیـد (کیفـاح)یـش بـە نوســراوێکی ڕەسمــی بــۆ ســەرەوەی بــەرز کــردەوە.. هەفتەیــەکی نەخایەند، فەرمانی بـوونی بـە بەڕێوەبـەری تـووتن دەرچـوو.. ئەمـە بووە سەرەتایەك تا هێندەی تر لە خۆبایی ڕووی تێبکاو بگۆڕێ.. لـە پێش چاوی هاوەڵەکانی دا ئەو مرۆڤە نەرمە نەما، کە پێشتر حەزیان پێدەکردو بە سەرو دڵ و ڕووێکی خۆشەوە گفت و لفتیان شیرن بوو.. لـە یەکـەم کۆبوونـەوەی دا، بـە نەزاکەتـەوە رووی کـردە سـەرجەم کارمەندان و وتی:((لـە وەرگرتنـی ئـەم بەرپرسـێتیەدا، ئـەرکی ئێمـە خزمـەتکردنی ئێـوەو خزمـەتکردنی ئـەم حزبەیـە، کـە لـە سـایەی دا هەموومان پڕۆژەو کارە خزمەتگوزارییەکانی دەبینین.. من برا بچووك و ئێوە برا گەورە.. هەر داواکاری و پێویستیەکتان هەیـە و بـە ئێمـە جێ بە جـێ بکـرێ، لـە خزمەتانـداین.. دەرگاشـم بـۆ ئێـوە هەمیشـە لەســـەر پشـــت و کراوەیـــە.. دەمـــەوێ وەك خێزانێکـــی ئاســـوودە و بەختیار بەیەکەوە بژێین.. هەمووان : خوشك وبرای یەکدین)).

**********

ئەفسووس، سێ مـانگ بـە سـەر یەکـەم کۆبوونـەوە تێپـەڕی، لـە وادەی دووەم دانیشتن دا، یەك بە سەد گۆرابوو بە سەرو زمانێکی تر ئاخاوت :((برایانی بەڕێز.. خوشکانی هێـژا : هـەمووتان دەزانـن لـەم

ڕۆژگاره دا که هەمموومان له ژێر سایەی ئەم حزبه، کارو بارەکانمان بەڕێوه دەبەین و ئەم حزبه وەك زامن و دابینکەری ژیان و بەرقەرار بوونی ئەمن و ئاسایشه له ولاّتەکەماندا.. بۆیه به دلّ و به گیان، ئەرکی سەرشانی گشت لایەکمانه پشتگیری له هەنگاوەکانی بکەین.. ئەوەی دەمەوێ لەم دانیشتنەدا،بیلّێم : ئەوەیه ڕووی دەمم ئاڕاستەی ئێوه بکەم.. پێم خۆشه به ئارەزووی خۆتان، دوور له هەر فشارو گوشارێك، بێنه پێش و پەیوەندی بەم حزبەوەبکەن)).

دووان له هاوڕێیه هەره نزیکەکانی چەند ساڵەی نێو دایەرەکه وەك گەردەلوولی گومانیان له خۆدا لولدا بێپەروا وتیان:((جەناب: ئێمه تا وەکو ئێستا به بێ لایەنی ڕەفتارمان کردووه، گەر لێمان بگەڕێن، حەز دەکەین هەروا به بێلایەنی بمێنینەوه)).

(مازن) رووی دەمی تێکردن و رازی قسەکانی هۆنیەوه :((ئەمه ڕاست نیه گەر بوترێ لەم مەملەکەته کەسی بێلایەن هەیه.... چونکه ملی هەریەکێك بگری، دەبێ مەیل و ئارەزووی به لایەکدا بجولێ.. له ناخەوه : هەست جوولاّندن، پەیوەندیەکی ناڕاستەوخۆیه.. جارێکی دیکه دووپاتیدەکەمەوه : ئێمه چونکه له ژێر سایەو سێبەری ئەم حزبه دەژێین، فەرموو ئەوەی ئامادەیه با فۆڕمی هاتنه ریز پڕ بکاتەوه، وه ئەگینا قبولّم نیه یەکێ لەم فەرمانگەیه دەوام بکاو حزبی نەبێت، ئۆبالّیشی له ملی خۆیەتی گلەیم لێ نەکات، ئەگەردوو ڕۆژیتر ئەو کەسەم بۆ جێگەیەکی تر گواستەوه، یادەرمکرد)).

هەمان رۆژ فەرمانیدا، له بەردەم ژوورەکەی دا پرسگەیەك دابنرێ.. (لەیلا)ی فەرمانبەر له بەشی (هاتوو رۆیشتوو)، وەك

ئافرەتێكی جوان و خەمرەوێن، دەكاتە سكرتێرەو لای خۆی دادەنـێ و لە شوێنان بۆ خۆهەڵكێشان، دەیووت:(حزبمان رێز لە كەس و كاری شەهیدان دەگرێ، (لەیلا)ش چونكە لە شەڕی عێراق و ئێـران شـەهید بووە.. وەك ئاوڕدانەوەو رێز لێنانێكی بچووك بۆ خانەوادەكەیان، ئەو شەرەفەمان پێ بەخشی).

هەر هەمان رۆژ، فەرمانێكی كارگێری دەركرد:

بۆ / گشت فەرمانبەران

بابەت: ئاگاداركردنەوە

بەمەبەستی وەرگرتنی ئیجازە، یا هەر داوایەكی تـر.. ئاگادارتـان دەكەینـەوە، دەبـێ بـە شـێوەیەكی یاسـایی پێشـكەش بكـرێ و بـە پێچەوانە وە، خودی فەرمانبەرەكە بەرپرسیار دەبێت

ئیمزا

بەڕێوەبەری تووتن

**هاوپێچ وێنەیەك بۆ/**

- خۆیەتی
- خولاو

**********

لە نیوەڕۆیەكی گەرمی هـاوین دا.. دوای تـەواو بـوونی دەوام بـە سەعاتێك، (مازن) بە پێوە دەنگ لە زەنگەكەی بەردەمی هەڵسـاند.. (لەیلا) دێتە ژوورەوە: ((فەرموو قوربان)).

+ وەرە گیانەکەم، دانیشە.. ئەمڕۆ جیا لە هەر ڕۆژێکی تـر دەبـێ بۆ هەندێ کاری پێویست بە یەکەوە بمێنینەوە.

(لەیلا) وەکو هەموو لەشی، شل و شەکەت بووبێ، پەیتا پەیتا بـە خاوەیەوە سەرەو ژوور هەڵکشا... (مازن) بە ئەسپایی دەرگاکەی لـە دواوە شیش داو بە هێمنی لە تـەکی دا لەسـەر قەنەفەکـە دانیشـت و وەك چـەند جـارەو گـەرم و گـوڕتر کەوتـە پیاهەڵـدان و وەسـفکردنی :((هـەموو دنیاکـەم لـەیلا گیـان.. ئاوێنــەی رووحـم، هێـزی هـەناوم، بیلبیلەی چاوم.. باوەڕ بکە خەریکە بۆت شـێتەبم.. خۆشـم دەوێ ی بە قەد کوردستان، بە قەد دونیا.. زۆرم پێویستی بەپەری ئاساییەکی وەك تۆیە شادومانمکاو بەختەوەر، بۆ هەر هەنگاوێك، لە ژێر ڕەحمـی جوانی و قەشەنگی تۆدا، چاو هەڵێنم و خـۆم لـە لوتکـە بدۆزمـەوە.. لێرەوە جارێکی دی، بەڵێنت پێدەدەم لـە داهاتوویـەکی زۆر نزیـك دا بێمە داخوازیت و داخوازیت بکەم)).

هێدی هێدی، لێی نزیك دەبێتەوە ئەنجام بەوە گەیشت، لە کچێنی بخات.

**********

(لــەیلا) وردە وردە زگــی دەپەنماوگــەورە دەبــوو.. ڕۆژ نــەبوو، پەنجەی گومان بۆ (مازن) درێژ نەکاو نەڵێ :((توخوا ئەوە ئـیش بـوو پێتکردم؟! تاکەی، چاوەڕوانی؟! بەخوای باوك و براکەم بەم کەین و بەینە بزانن دەمکوژن و وەکو کاریلە قووتە سەرم دەبڕن.. دەپێم بڵێ

: کەی دێیە داخوازیم؟! بەسسە.. چیتر ئارامم نەماو ئۆقرەم لەبەر بڕا)).

(مازن) چاوەکزەکانی بە ئارەزوویەکی ژیلەمۆیی گورج دادەگێڕێ.. بەدەم پرسیارەوە، سەیری بەردەمی خۆی دەکاو وەك گاڵتە بە ئەقڵی بکات، بە پۆزێکەوە :((جا لەیلا گیان، کێ دەڵێ: باوك و براکەت رازیدەبن، تۆ بەمن بدەن، منێك خاوەنی ژن ومالم).

- بۆ رازی نابن؟!.

+ کەواتە نەختێك لەسەرم بوەستە، تا رێو شوێنێکی لەبار، لە دابینکردنی ئەو ڕێو ڕەسمە، دەگرمە بەر.

- تێناگەم.. مەبەستت لە دابین کردنی ئەو ڕێو ڕەسمە چیە؟!.

+ پێش هەر شتێك، مەبەستم ئەوەیە دەبێ دڵی سورمێ رازیبکەم و حەمەلاوی باوکیشم لەو مەسەلە ئاگادار بکەمەوە.

(لەیلا) سەری ەمتەرخەمی بۆ ڕاوەشاند :((با وابێ)).

**********

ئێواریەکیان بۆ هەڕەشەو چاو سوورکردنەوە، مەلا تازە بانگی شێوانی دابوو.. (عەزیزی) ی باوکی لەیلا و (مارف) ی برایی و (سەدیق) ی ئامۆزای، هاتنە مالی.

(عەزیز) سێ چوار جار، پەنجەی شایەتمانی نایە سەر پلاکی زەنگەکەو دایگرت.. (مازن) دەرگاکەی خستە سەر پشت. کە چاوی پێیان کەوت.. دۆش داما.. بە خەمباری و خەمساردییەوە: ((فەرموو کاك عەزیز.. یاخوا بەخێربێن.. فەرموو بۆ سەرەوە هەڵکشێن)).

لە هۆڵی پێشوازی دا سەرچاوەیان گرت.. (عەزیز) مرخەیەکی لێ کردو بە قووڵی تێیڕاماو.. بە دەنگێکی بۆری رقاویەوە :((کاکە مازن راستە ئەمرۆ تۆ کار بەدەستی.. وە لێ ئەفسووس کارێکی هێندە ناماقوڵت کردووە، پیاو شەرمی بەخۆیە باسی بکا.. زۆران لۆ کەمان نەڵێین : تۆ کچی ئێمەت خرا کردیە و لە کچێنیت کەوانوە،کە... )).

(مازن) دەستێکی راوەشاندو قسەکەی لە دەم قۆستەوە :((من لەم شتەدا بێئاگام.. دوای ئەوە کەس نیە نەزانێ ئەو کچەی تۆ دامەن پیسە، ئیتر خەتای من و بەرۆکی من بۆ دەگرن؟!)).

(عەزیز) حەپەسا.. دەمی بوو بەتەڵەی تەقیو.

(مارف) بە ورتەیەکەوە :(چۆن خەتای تۆ نیە؟! کوڕە خوا بناسە)).

(سەدیق) بە دەنگێکی گڕتر :((کابرا، جوان گوێبگرە: ئابڕوو بردن شتێکی ئەوەندە کەم نیە، پشتگوێ خرێ و بەهەند هەڵنەگیرێ.. بە کورتیەکەی تا حەیاو ئابڕوومان نەچووە، هاتووین نامووسانەی لەیلا بدەی و دوای ئەوە بیگوازییەوە دەنە بە خۆمان دەزانین چی دەکەین)).

(مازن) چاوی پەڕیە پشتی سەری: ((چی؟! چما دەتانەوێ، لە ماڵی خۆم دا هەڕەشەم لێ بکەن؟! کابرا تۆچی؟! کەس تا ئێستا زاتی ئەوەی نەکردووە بەم شێوەیە لەگەڵمدا بدوێ)).

(عەزیز) بزەیەکی تاڵ بە لێوبا چزاو مێشکی بروسکەی بەیەکاچوونێکی دا: ((ئیستەغفیروڵڵا.. کێ حەددی هەیە هەڕەشەت لێبکا؟! بەڵام مەردی خوایە، تا ئابڕوومان لە ناو خەڵك نەتکاوە،

ســەرباری ئــەو زوڵــم و تەعدایــە، فــەرموو.. پیاوانــە وەرە پــێش و بیگوازەوە. گەر دەڵێ ی حەزی پێناکەم.. با دوو هەفتە، سێ هەفتە لەلاتبێ، ئەوجا تەڵاقی دەدەی، تەڵاقیدە)).

(ســورمێ) بــەم قســانە، کــە ســەرو چــای لەبــەردەم دانــان.. بــە تورەییەوە، ئاوڕی لە (عەزیز) دایەوە و.. لە مووی سەری تــا نــووکی قاچی، تێیڕاما.. ســەری بــادا.. کــە لچــی هەلقرچــاند، بــە لاڵووتیــەوە :((حەی، حەی.. ئەوە چیە؟! بەو ئاخیری عومرە، ئەوەی نەماندی، دیمان.. ئێوە گەرەکتانە. بەزۆری زۆرداری پیاوی من بە بێحەیا بدەنە قەڵەم، لە کاتێك دا، کچی ئێوە قەحپەیە.. بۆ ناچن یەخەی ئــەمێك و ئەوێك بگرن؟! بۆناچن لە کچەکەتان بپێچنەوە بزانن بە چ شــێوەیەك خــۆی بــۆ خــەڵکی رووتکردۆتــەوە و چــۆن خــۆی داوەتــە بــەر هینــی خەڵکی؟!)).

(سەدیق) قارو غەزەب گرتی.. ویستی زللەیەکی تــێ بســرەوێنێ و بەسەری دا بقیڕێنــێ.. رووی بــەلادا وەگێــرا :((ژنەکــە.. تــۆ ســەرەتا شەکرتخوارد.. لەیلا لە گوڵ پاکترە.. فەرموو بزانم چ قەحپەییەکت لێ دیووە، بەو شێوە زمانت دریژ دەکەی؟! پیاوەکــەت، مەســئوولە بــۆ ئەوە مەسئوول نیە، زوڵم لە خەڵکی بکا)).

(مــارف): ((ئێمــە دەســت هــەڵناگرین و لــە هــەقی خۆمــان خــۆش نابین)).

(عەزیز): ((مازن جوان گوێبگرە، ئێمە دەڕۆین.. مۆڵەتت تا سبەی ئێوارەیــە بێیــە پــێش، وە ئــەگینا... دەی هەڵســن بــا بــڕۆین)). بــە شڵەژاویەوە پشتیان تێکردو ڕێ و ڕێ گەڕانەوە.

(مازن) سرك بوو.. ڕەنگی دەم و چاوی وەك پەلكە لیمۆ زەرد هەڵگەڕا.. ڕوومەتەكانی ئەوەی دڵۆپ خوێنە، تێیدا نەما.. پاڵكەوت.. كاسكێتە ڕەشەكەی نایە بان چاوی و دەستی ڕاستی خستە سەر و نقوومی دەریای بیركردنەوەیەی بێئامان بوو.. كەوتە دووان: ((من لەگەڵ ئەم دیمەنە نەگریسانە ڕانەهاتووم.. واباشە بكەومەخۆ و كارێكی وایان پێكردم با بەدەواری شڕی نەكردبێ)).

قیتبوّوە.. دەستی گەیاندە تەلەفۆنی سەر مێزەكە و چەندژمارەیەكی لێدا: ((بنكەی پۆلیسە؟! ڕەفیق (مازن) لەگەڵتانە، هەندێ شت رووی داوە، هەر ئێستا بگەنە لام)).

زۆری نەبرد، چەند پۆلیسێك بە مێكزەمینێكەوە دەركەوتن.. (سورمێ) تا بەر دەرگا، لەگەڵی چوو :((گیانەكەم مازن زۆرت ئاگا لەخۆبێ.. دەستت لێ نەوەشێنن؟!)).

(مازن) بەدەم سواربوونەوە، سڵاوی لە هەمووان كردو بە شوفێرەكەی وت:((ڕاستەو ڕاست، باژۆ)).

هێشتا (عەزیز) و (مارف) و (سەدیق) بەڕێوە بوون، لە نیوەی ڕێ مێكزەمینەكە دایشكاندە سەریان و پێشیانی لێگرت، كە چوار دەورەیان گیرا، بە پەلبەستراویەوە :((دەفەرموو، ئەوجا سواربن)).

**********

دوو هەفتە گیران.. بۆ بەردان، كەس و كاریان، كەس نەما لەبەری نەپاڕێنەوە.. دوا شت سێ چوار پیاو ماقووڵ و ردێن سپی گەڕەك، بە دەست و دیاری، خۆیان كوتایە ماڵی (مازن) و خۆیان دەخیلی كرد:((دیارە

به پیاوت دەزانین، بۆیە سەربە ماڵت دادەگرین.. ئازاد بوونی ئەو پیاوانــە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە جەنابتەوە هەیە، دەبیٚ لە بەر ئێمە لێی خۆشــبی و ناماقوولڵیان کرد جارێکیتر کاری وا دوووبارە بکەنەوە )).

ئەویش حەزی بەو جۆرە لەبەر پاڕانەوە بوو.. وتی ((هەر لەویٚ تا ئێــرە بەخێربێن، بە سەرچاوان.. مادامەکیٚ هاتنــە مــاڵم، قســەتان ناشــکێنم.. ئەوەی لە تواناداییٚ، درێغی ناکەم.. بەڵاٚم ئەگەر حزب هەر ئازادی نەکرد، ئەوە لە دەسەڵاٚتی مندانیە.. دووبارە بەڵێنتان پێدەدەم کە ئەوەی لە توانــا دابیٚ، درێغی نەکەم )).

**********

ڕێــو رەسمــی ئــازاد کردنیــان لــە منەززەمــە بەڕێوەچــوو.. رائیــد (کیفاح) تێیانڕوانی.. خێسەیەکی لە قیافەو چرووچاوی (عەزیز) کــرد کــە چــاوە خورمابیەکــەی لــە دونیــای خــەونی مردوانــە دا لــوولی خواردبوو.. زمانی لێخستنە کار :((جوان گوێبگرن... ڕەفیق (مــازن) لای ئێمە نیشــانەی ڕاســتگۆیی و دەســتپاکی و متمانەیــە.. ئێســتاش سەرم سوڕ دەمێنیٚ: ئێوە چۆن توانیتان و زاتی ئەوەتان کرد لە ماڵی خــۆی دا هەڕەشــەی کوشــتنی لیٚ بکــەن؟! دەترســم لــە گــویٚ ی گــا نووستبن.. لە مێژە ماوەی دوو ساڵە زانیاریمان لــە ســەر کچــی ئێــوە پێگەیشتووە کچەکەتان ئەم و ئەو دەستی پێگەرم دەکاتەوە و پێــی ڕادەبوێرن.. خانمیش لەو هەموو خەڵکە، گرگرِ هاتووەو خۆی لەســەر ئەم ســاغکردۆتەوە.. بەوەنــدە ســوندو قوڕئانــە، ئەگــەر ئــەو لێتــانی نەبوردایە، مەحاڵبوو من لێتانخۆشبم.. هەر لــە ئێســتە تــا دە ســاڵیتر

ئەو كابرایە لووتی بە خوێن و هەر شتێكی لێبەسەر بێ، ئەوە یەخەی كەس ناگرین، ئێوەن.. فەرموو وەرنە پێش، ئەم وەرەقە مۆركەن)).

كــە یەكــە یەكــە، وەرەقەكــەیان مۆریــان كــرد.. بــە نیمچــە توورەییەكەوە ((ئەوجا خواحافیزتانبێ )).

لە بەردەم ئەو هەڕەشەی لەبەر چاویان ڕووی دا.. تەڕاییان لەسەر لێوو ناودەما وشك بوو.. بێ هیچ نـاڕەزایی دەربڕینێـك، ملـی خۆیـان شۆڕ كردو ڕێو ڕێ گەڕانەوە.

**********

لە شــەوێكی ناوەخــت، هەرسێكیان لەبــەر هەیوانەكــە بەیەكــەوە دەوەستن، وەك بەدەم زامێكی پڕ لە خوێوە بتلێنەوە، كەوتنە چرپە چرپ و فسكە فسك، چۆن (لەیلا) بفەوتێنن و لە ناوییەن؟!.

(لــەیلا) لــە پەنجــەرەی ژوورەوە هــەڵبڕوانی و كــە ئــەوانی بــەم شێوەیە بینی، تۆتكەی نەگرت و نیازیبوو : دەنگ لە ڕوویان هــەڵبڕێ و بڵێ :((دەستم دامێنتان.. ئەوەی من كردم، ئێوە مەیكەن.. بمبورن لەو هەڵەیە، توخـوا بمبـوورن.. تۆبـە جـارێكی دی كـاری وا دووبـارە ناكەمەوە)).

(مــارف) بــێ هەســت و خوســت چــووە دەرەوە و زۆری نەخایانــد بەلەندگرۆزێكەوە پەیدا بوو.. كت و پڕ هێرشیان كردە سەر (لەیلا) و تونــد دەم و دەســتیان بەســتاوە و بەڕاكێشــان، خســتیانە قــوونی لاندگرۆزەكــەو بەهەڵــەداوان بــەرەو كــەناری ڕووبــاری دەرەوەی شــار تێیانتەقاند.. (لەیلا) هەر چەند كردی و كۆشا هەوڵێ بۆ دەرباز بوونی خۆی بـدا، بێسـوود بـوو.. هەناسـە سـوار.. ماندویـەتی ئارەقەیـەكی

زۆری پێڕشت و فرمێسك له چاوی دا فوارەی بەست لرخ لرخی قوڕگی دەگەییە بەر گوێ.. لاندگرۆزیان له بەردەم ڕۆخی ڕووبارەکە ڕاگرت و بەربوونە وێزەی.. بـه شـەق و پێلاقـه و پاڵـدان دایـانگرت و هـەردوو دەست و قاچیان له بەردێکی یەکجارگەورە پێچـاوە و فڕێیاندایـه نـاو ئاوەکە.. ئەو نقوومبوونەی لەیلا نقومبوو، هەڵنەستایەوە.

پەیوەندیکردنی (عارف) بە حکومەت، لە ڕێ ی (مازن) بوو بە دەستکەوتێکی گەورە و لە قیادەی قوتڕییەوە، سوپاسنامەیەکی ئاڕاستە کراو دەمانچەیەکی چواردەخۆریان بە دیاری بۆ نارد.

(فاخیر) لە ژیانی پێشمەرگایەتی، حیمایەی شەخسی (عارف) بوو.. بە دوو مانگ پێش تەسلیم بوونەوەی (عارف)، ئەو تەسلیم بۆوە.. هاوڕێکانی بە دەم غەم و پەژارەوە، پێیان دەوت :((توخوا کاکە فاخیر : بۆ قارەمان و خەباتگێڕێکی وەك تۆ، گوناهنیە تەسلیم بیەوە؟!)).

(فاخیر) بەو قسانە بێتاقەتیەکی قووڵ، دایدەگرت :((هەموو شتێ هۆکاری خۆی هەیە.. عارفی ئامۆزام : ڕەقەڵە.. تەوێڵی پان.. بڕۆی تەنك و درێژ.. چاو شینە، پێلووی کورتو سمێڵی قەیتانی ماش و برنج بوو.. هەمیشە لێرەو لەوێ شانازیم پێوە دەکرد :چ وەك خزم، چ وەك ئەو مەسئولیەتەی هەیبوو.. لەهەر شوێنێك باسی عارف بهاتایە، خەڵك بە نموونەی بەرزی دەست و دامێنپاك و چاونەترسیان دەدایە قەڵەم.. ئەمەش وایکردبوو، رووی لە هەر جێگەیەك بکردایە، بەڕێزەوە پێشوازی لێبکەن مانگێك و چەند ڕۆژێ، بارەگەکەمان لە یەك لە ئاواییەکانی چیای مەزن دانا.. عومەری هاوڕێم وەك حیمایەی شەخسی عارف بوو.. زۆربەی وەخت، من و ئەوی دەبردەوە ماڵی خۆیان.. ئەو سەرنجەی لام دروست بوو بوو : هەستم ڕادەگرت.. دیقەتم دەدا : عارفی ئامۆزام هەر کە چاوی عومەری لێ بزر دەبوو، لەگەڵ فاتێ ی خێزانی عومەر دەکەوتە چاو بازێ و چاو چاوانێ، چ

جای پێکەنین و تریقانەوە بە دەم یەکدی.. بۆ قسەکردنی بەردەوامی نێوانیان، ئەوە هەر نایەتە باس.. وەك پەی بردن بە نهێنیەکانی ئەو، دەمبینی ماوەیەکە بێ حەد لە جیهانی واقورِمانی خۆی دەتلێتەوە.. شتێکی لە دلّدایە و نازانێت چۆن پیادە دەیکا. ئێوارەیەکیان، بەرە بەری مەغریب، پێشمەرگەکان خڕ دەکاتەوەو بە دوای گشت خەڵکی ئاوایی دەنێرێ و بە دەنگێکی گڕی نێرانە، دەڵێ :((برایان.. خوشکان: هەواڵمان پێگەیشتووە، ڕژێم بەتەمای هێرشکردنە بۆ ئەم دەڤەرە. بۆیە دەبێ هەموو گەنجان وکوڕگەلی ئاوایی، بە فیرارو بێفیرارەوە، بە جارێ ئەوەی چەکی خۆی هەیە، ئەمشەو شان بە شانی پێشمەرگە لەو چیایە بمێنێتەوە و هاوکاریمان بکات.. هەر کەسێکیش کەمتەرخەمی بنوێنێ، خۆی بەرپرسیارە)).

کەوتمە دوای.. لە تەنیشت خانووی عومەر، هەڵوێستەیەکی کرد، ئەو خانوەی لە چاو ماڵەکانی تردا، لاتەریك و لاچەپ بوو.. ئاوڕێکی دەوروبەری دایەوە و بە تەوسێکەوە وتی:((زۆرم پێناچێ، تا ژوورەوە دەچم.. دوورو نزیك ناهێڵی و لێناگەڕێی کەس بەم ناوە گوزەر بکا)).

بەسەر دیوارەکە، خۆی ئاودیوی حەوشەکەیان کرد، ئەو دیوارەی بە بەردو قوڕ چوار ڕیز لەسەریەك، کەلەکە کرابوو.. منیش تاق و تەنیا، کەوتمە چاوگێڕان و دوای تاوێك، لە دەروونەوە بەخۆم وت:((توخوا ئەمە ئیشە؟! بلێ : عارف، تۆ کێت پێ دەلێن؟!. ئیشی تۆ بەو ژنە چیە لە کاتێکدا عومەرت بە واجب ناردۆتە دوورترین شوێن؟!. ئەو ماستە مویەکی تێدایە.. ئەگەر مەبەستی ئەوەیە پاروە نانێکی لابخوا، بێشك دەیوت:((زۆرم برسیەو وا دەچم نەختێ نان

دەخۆم)). لە دواکـەوتنی دا ترسـام شـتێ بـووبێ.. چـەکەکەی شـانم داگـرت و خـۆم ئـاودیوی ماڵیـان کـرد.. بـە ئەسـپایی چـوومە بـەر پەنجەرەکـە، کـە پەردەکـەی بـاش بەسـەریەك دانـەدرابۆوە.. لـە دەرزێکـی بچـووك، سـەرنجم دا ئـەوە خـەریکی دەسـت بازیـە لەگـەڵ فاتێ.. هەر دەم و دەست، وازایە میشکمەوە ئەگەر هـەردووکیان لـە جێـوە سـاردکەمەوە، چـی دەبـێ؟! ئـای نمەکحەرام،سـەرەڕای ئـەو هـــەموو خزمەتـــە، ئـــەوە چـــاکەو پیاوەتیـــە دەیدەیـــەوە.. وەلاٌ تەواومانکرد.. ئەویە: نانیشی دەخوا و سواری ژنیشی دەبێ.. کەسێ ناپاکی دەرهەق بە هاوڕێ و هاوسەنگەری خۆی بکا ئەوە بـێ گومـان رۆژەك دادێ هەمان ناپاکی بەرامبەر ئێمەش بکاو بمانفرۆشێ.. عارف خۆی لە فاتێ تێرکردو هاتە دەرەوە. وەك تەواو خاوبووبێتەوە، خۆی لەبەریـەك کێشـاوە.. وتم:(( ئـامۆزا، چـۆنە وادوکـەوتی؟!)). بـە زەردیەکەوە وتـی: (کاتێ خەریکی نانخواردن بووم، هەندێ بەرنامـەم بە مێشك داهات.. خەریکمام.. بـیرم لـە داڕشـتن و پیـادەکردنی ئـەو بەرنامە دەکردەوە). لە دڵەوە وتم:(ئای کە تەڕ وانیـە.. ڕاسـتەکەی، بیرت لە بەرنامەیەك کردۆتـەوە چـۆن و بـە چ شـێوەیەك جـارێکی تـر فرسەتێکی دی وەربگری و بچییەوە گیانی فاتێ؟!)).

بـــەرەو ســـەر گـــردو تەپۆلکـــەکان هەڵکشـــاین.. (عـــارف) لـــە بەسەرکردنەوەی مۆڵگەکان دەیوت: (چاوتان ماچ دەکەم.. وریا بن.. ئاگاتـــان لـــە خـــۆبێ و نەکـــەن غـــافڵبن). بـــۆ بـــەیانی دەمـــە دەمـــی چێشتەنگاو، هەواڵی نارد:(جواب بنێرن ئەو خەڵکـە دابـەزێ و بـەرەو ئـیش و کـاری خـۆی بـڕوا. ڕژێـم پیلانەکـەی بـە پێچـەوانە دەسـت

پێکردووەو بەرەو سنووری ڕۆژهەڵات، لە پێشڕەوی دایە). تەواو پڕ بوو بووم، نازانم چۆن بە زمانی بڕاوەوە ئەو نهێنییەی عارفم لای هاوڕێیەکم درکاند؟! قسە کەوتە زارەکی، دەکەوتە شارەکی.. ئەم دەنگ و دۆیەی پێگەیشتەوە، بە توڕەییەوە بانگی کردم، هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا. کە توند یەخەی گرتم، کەوتە نەوازشدان:(مرۆڤی دڵسۆز ئەوەیە لە بەرامبەر هەر عەیب و عارێکی هاوڕێ و هاوسەنگەری دا، چاو پۆشی بکاو نهێنییەکانی دەرنەخات.. تۆ ئامۆزای منی، چ جای هاوڕێیەتی : قەت مومکین نیە لە ئاست بوختان و شت هەڵبەستن، بتبوورم.. فاخیر، تۆ هیچت لێدیوم؟! وەڵامم دەوە). منیش وەك بە دەستیەوە بوویم بە گەڵای دەم ڕەشەباوە، گەنە ئارەقێك کەوتە سەر لەشم و بە شڵەژاویەوە، وتم:(ئامۆزا گیان، حەزناکەم گوللە بە تاریکیەوە بنێ ی و گومانم لەسەر دروست بکەی و بە گومانەوە تێمڕوانی، من کە هیچم لێ نەدیوی.. بۆ شەرمت لێ بکەم؟! هەر هەڵەیەکت هەبێ، ڕاست و ڕەوان، پێت دەڵێم). بەم قسەیە، خاوبۆوە.. دەستی لە یەخەم هەڵگرت، بەڵام ترسێکی زۆرم لێنیشت.. زانیم لێم چووەتە ڕق و کینە و وا بە ئاسانی لێم خۆش نابێ.. بیرم لەوە کردەوە گەرنەکەومەخۆ، سەرم بە فەتارەت دەداو دەمفەوتێنێ، بۆیە خۆم تەسلیم کردەوە)).

**********

(عارف) لە پەڕینەوە بۆ ئەو گوندەی دامێنی چیای مەزن، بانگی (عومەر) دەکاو زەردەخەنەیەك بەسەر لێویا دەکێشێ و بە کزییەوە :((کاکە عومەر: لە ماوەی پێشوو زۆرمان ئەزیەت خستنەبەر..

سوپاسی ئەو هەستە ناسك و پیرۆزەتان دەكەم ئەزییەتتان خـوارد.. ئەوە ئێستاش چەند ڕۆژێكـە لێـرەی بـەڕوای دەزانم وەك پاداشـتێك، ئیجازەی مانگێكت پێبدەم سەر لە ماڵ و منداڵەكەت بدەی)).

(عومەر) لـە گەڕانـەوە، بـۆ ئـەو قسـەیەی فـاخیری ناكەوێتـە بـەر گوێ.. دەگاتە جێ، هەر لە حەوشەوە چـەكەكەی شـانی دادەگـرێ و بـە چـەند فیشـەكێك،فاتێ ی ژنـی سـارد دەكاتـەوە.. ئـەوجا ڕووی وەردەگێڕێ و ڕێ و ڕێ بەرەو سەركردایەتی ملدەنێ و شكات دەكا.

بروسكەیان كرد كـە بـە ئاگاداربوونـەوەی (عـارف) دەم و دەسـت بچێتە بارەگای سەركردایەتی و هاوڕێیەكی گیانی بە گیانی بروسكەی بـۆ دەكـات: ((براكـەم عـارف: بروسـكەی ئاگاداركردنـەوەی تـۆ، بـۆ دادگایی كردنتە دەرهەق بەر تۆمەتەی خراوەتە پاڵت.. بۆ ئاگاداری و ئەوەی پێویستە)).

لەو ماوەیـەدا، ئەسـپی خـەیاڵ هـەڵی دەتێزانـد و سـوارەی بـیری هەڵدەگرت.. جـەمێ لـە جەمـەكانی نیـوەڕۆی مـاڵی كێخـوا سـلێوە، چێشـتێكی زۆریـان بـۆ دەكـرێ.. خـۆی شـێلو ناكـاو بـە بـاوەڕێكی پتەوەوە، بانگی كرد:((پێشمەرگەكان، ئەوانەی لە دەرەوەن، بابێنـە ژووری.. ئێمـە كـە لـە مـاڵێكی خانـەدان و بـەڕێز بـین، پێویسـت بـە ئیشكگرێتی ناكا)).

نان خورا.. یەك لە كوڕە بچووكەكانی كێخوا سـلێوە، بـە هەناسـە بڕكێوە، دێتە ژوورەوە :((بابە.. بابە حكومەت بە تانك و زرییۆش، لە پێشڕەوی دایەوا بەرەو گوندەكەمان دێ)).

یەك لە پێشمەرگەکان، ئەو چەکەی لە تەنیشتی خۆی دانابوو خستیە ناو هەردوو لەپی دەستی. و تەکانی دایە بەرخۆ.. ڕاست بۆوە.. (عارف لێیڕاپەڕی و چەکی لێ ڕاکێشا :((هێ ی نەجوڵێ ی؟! دەی دانیشە، ئەمڕۆ حکومەت میوانمانە)).

ئابلۆقەکەی گوندەکە دراو (مازن) لەگەڵ ئەفسەری ئەو هێزە، دابەزی.. پێشمەرگەکان یەکە یەکە بە کزۆڵیەوە، هاتنە دەرەوە. کش و مات لەبەردەم دیوەخانی کێخوا سڵێوە وەستان.. (عارف) دەمارە ڕەپیوەکانی لاجانی گوشی.. لچ و لێوی ڕەویەوەو ئەوەندە کرانەوە، سیمای دەم و چاوی تێکچوو.. رووی بەلادا وەڕگێڕان :((مەترسن.. هەموو شتێکم دابینکردووە)).

یەخەی کراسەکەی بەری هەڵپچڕی و ئەو ناسنامەی تیا دەرکرد کە لە دایەرەی ئەمنەوە بۆیان ناردبوو.. تەوقەی لەگەڵ ئەفسەرەکە کردو دەگەڵ (مازن) دا ئەم لاو ئەو لای یەکتریان ماچ کرد.

ئەفسەرەکە لەڕەنگ و ڕووی هەمووانی ڕووانی، چ خۆش و سۆزو خۆشەویستی هەیە لای چ کامێکیانی بەدی نەکرد.. بە گوڕەوە: ((ئێوە لەم لەحزەوە، مامەڵەو ڕەفتارێکی ترتان لەگەڵ دەکرێ و ڕۆڵەی ئەم میللەتەن)).

پێشمەرگەکان، کەسیان خونچە زاری نەپشکوت و لە حەشمەتان، نیگای پڕ گومانیان ئاڕاستەی یەکدی کرد و وەڵامی دەیان پرسیاری مەلۆتکە شەوەی تر دەیبردنەوەو بیریان لەو مەرگەساتە کردەوە، کە قەت بە خەیاڵیان دانە دەهات،(عارف) ئەو خیانەتە گەورەیان دەرهەق بکا.

**********

زۆر بەڕێزەوە بردرانە بەڕێوەبەرایەتی ئەمن.. دوو شەوو دوو ڕۆژ لێکۆڵینــەوەی خۆیانیــان لەگــەڵ ئەنجامــدان و بــە (عــارف) یــان ڕاگەیاند:((گەر ئامادەی بە دڵسۆزیەوە بـەرگری لـەم حزبـە بکـەی.. بڕیارێکی وامان لەبەر دەستە، مەفرەزەیەکت بدەینێ)).

ئەویش بە ڕاشـکاوی وتـی:((بـەڵێنتان پێـدەدەم، هـەر ئـەم پۆلـە خەڵکەی لەگەڵمدانە وەك لەولا بـە دڵسـۆزییەوە ئیشـمان دەکـرد، بـۆ ئەم حزبەو سەرۆکی فەرماندە، وابین)).

هـەر ئـەو شـەوە چـۆوە مـاڵی بـاوکی.. هەناسـەێکی داخ و برینـی ناکامی هێنایە سویێ.. دەریای تۆڵـە لـە نـاخی دا شـڵپ و هـۆڕی دا و مێشکی لە (فاخیر) ی ئامۆزای خستە کارو ئەو گڕەی تێیبەر بوو بوو، هێشتا بڵێسەی دەسەند:((فاخیرە فەنی : ئەو ماوەیە خـۆت تەسـلیم کردەوە لاتوایە لە نووکی قولابی من ڕزگارت دەبێ و ئـیتر بـبڕای بـبڕ دەستم ناتگاتێ؟! چارەت دەکەم فاخیرە فەندی، ئەگـەر زمـانی تـۆ نەبوایە، بۆ رۆژم بەو رۆژە دەگەیشت؟!)).

**********

دوای تێپەڕ بوونی هەفتەیەك بە سەر وەرگرتنـی ئـەو پۆسـتەیە.. شەوێکی درەنگ، بە ناوی پێشمەرگەوە، مەفرەزەیەکی دەمامککراوی دەنێرێتە سەرو بە بێجامەو نەعلی بەریەوە لەناو جێگـەی دەردێـنن و دەیڕفێنن.. پاش کوشتنی، لە دەرەوەی شار فڕێی دەدەن:((دەبخـۆ دەی هەی سـەگی سـەگبابخێو سـرم هەڵـدەماڵی.. ئـەوەی گـۆڕم بـۆ هەڵکەنێ، دەبێ خۆی بکەوێتە ناوی)).

(عــارف) لەبــەردەم کۆلاّنەکــەیان دا، هــەر کەســێکی ببینایــە، تەســبێحی درێــژی بــە دەســتەوەیە، ســەرێکی لــە پیاوەکــانی بــادەدا:((دەی لەشــی ئــەو گــەواد باوکــەم بــۆ خاوکەنــەوە.. دیــارە پێشمەرگەی خۆش دەوێ، بۆیە ئەو تەسبێحەی درێژ کردووە )).

خۆ ئەگەر لەبەردەم کۆلاّنەکەیان دا یەکێکی بدیبایە ڕیشی درێـژی بەرداوەتەوە،ســەری لــە پیاوەکــانی بــادەدا :((دەی لــە ئاودەســتی قایمکــەن و پرێمــزێکم بــۆ بێــنن)). کــە بــە دەســتی خــۆی ڕیشــەکەی هەڵدەکڕوزاند:((هەی خوێڕی، ئەو ڕیشــە مانــای چــیە؟! نەخەلــەتێی جارێکی تر هەڵەی وابکەی)).

ئەوانەش لەو لێدان و کوتانە بێبەش نەدەبوون، کە جـل و بـەرگی ڕەشیان دەپۆشــی:((هــەی سەگشــێر دیــارە چــاوت بــەم حــزب و بــەو حکومەتە هەڵنایە، کەرەتێکی دی ئەو جلە ڕەشەت لەبەردا ببینم، بە جلەوە دەتسووتێنم)).

بە ئاشکرا کردنی تۆڕێکی ڕێکخستنی ناو شار، هێندەی دی، حزب گرنگی پێدەدا و وێڕای ڕشتنی پارەو پولێکی زۆر، دوو ســەیارەی بــە دیاری پێشکەش دەکەن

(عارف) تەمەنێکی زۆر نەژیا.. برادەرێکی کۆنی سەردەمی منالّی، داوەتی سەر ڕەزو بـاخێکی هاوڕێیــەکی خــۆی دەکا کــە ســەر تــۆپی خــواردن و خواردنــەوە، کــاتێکی خــۆش ببەنــە ســەر.. پــێش چــوونە سێبەری ئەو ساباتەی لە ناوەڕاستی باخەکە دروست کرابوو.. بەدەم پیاسەو قسەی خۆش، دەست دەگەیەننە هەندێ لەو بەرهەمانــەو بـۆ پشوودان، دەچنە ژێر ساباتەکە.. سێ پیاوی کەتەو جەربەزە، تونـد

لـە دواوە، پـەلاماری دەدەن. ئـەویش دەیـەوێ دەسـت بکاتـەوە و تەقەیان لێ بکات.. بە چەقۆ سەری دەبڕن و تەرمەکەی بۆن بۆگـەنی دەبێ و بەرێکەوت شوانێك دەبینێ ئەو تەرمە فڕێدراوە، خەبـەرداری بنکەی پۆلیس دەدا.

(مازن) شەکەت و ماندو، کاتێك لە دەوام گەڕاوە، بەبێ خۆگۆڕین جەستەی فڕێدرایە سەر سیسەمەکە و لەسەر گازەی پشت ڕاکشا.. چاوی بڕیە بنمیچی ژوورەکە و چاوە پەڵماویەکانی لە ژێر جووتێ بڕۆی هەڵکروزاودا، زەق دەچۆوە. (سورمێ) لەنگەری بیرکردنەوەی تێکدا:((ها گیانەکەم، ئەوە چ خێرتە داڵغەت لەچیداوە؟!)).

(مازن) بێ ئاگا لە کوشتنی (عارف)، هەناسەیەکی قوڵ هەڵدەکێشێ:((سورمێ گیان : کە سەیری بارودۆخی (عارف) دەکەم لەسەر دەستی من تەسلیم بۆتەوە ولە دەوڵەمەندی دا و ئەو ژیانەی بۆی ڕەخساوە، من چارەگی ئەوم نیە و بیرکردنەوە لەم هاوکێشەیە، بێتاقەتی کردوم.. وا هاتۆتە مێشکم، تەفەروغ لەو فەرمانگەیە بکەم و عەریزەیەك بنووسم، نەك بۆ وەرگرتنی مەفرەزە، کە ئەو پلەو پایە لە ئاستی شان و شەوکەتی مەقامی مندا نیەو هەوڵەکانم زیاتر لە پێناوی وەرگرتنی پۆستی مستەشاری دەخەمەگەڕ.. متمانە و باوەڕم بەخۆ پتەوە.. بە نووسینی ئەم عەریزەیە، لاری نانوێنن و موافەقەت دەکەن.. لەم ڕۆژگارە شوومەدا پیاو خاوەنی چەند حیمایەکبێ چ جای ئەوەی شەخسیەتێك بۆ ئەو کەسە دروست دەکا کە لە هەمان کات هەیبەتەو خەڵك بە چاوێکی دی سەیری دەکات، بەلاّم ئەو ترسەی لێم نیشتووە، داواکردنی چالاّکیە، بۆ نموونە کوشتنی پێشمەرگەیێك، نازانم بڵێم چی؟! ناکرێ خۆم وەك ئەو کابرایە لێکەم، لە جیاتی سەلکە پێشمەرگە، شێتێکی کوشتبوو.. کاتێك دایەرەی ئەمن، نوسراویان بۆیکرد.. کەس و کاری شێتە، لە تاوا شوێن نامێنێ

سەری پێدا نەگرن و کاتێ دەچنە ئەو دایەرەو بەسەرهاتی منالە شێتەکەیان دەگێڕنەوە، سەلکە زەلامەکەیان نیشاندەدەن، باوکەکە دەداتە سەری خۆی و بە دەم فرمێسك ڕشتنەوە:(وەی باوکە ڕۆ.. ئەوە کێ ئەو کوڕەی ئێمەی سەربڕیەوە؟! شەیتان بە شەیتانی خۆی، لەسەر دونیا، دەستی لێ شۆریوە.. چ ویژدانێك قەبولدەکا:شێت سەر ببڕدرێ؟!). بەمە هێشتا، فەرمانی گەڕانەوەی کابرا بۆ وەرگرتنی ئەو مەفرەزە دەرنەچوو بوو، بانگ دەکرێ و گوللەبارانی دەکەن.. ئێمە لە ڕۆژگارێك داین ئەوەی کاریگەری خۆی هەیە، تەنها هەشت و پشت و مشتە و خوێندەواری.. بڕوانامە.. زانست و زانیاری، فلسێکی قەلب ناهێنێ.. لە شانسی من دا، هەفتەیەکە رائید (کیفاح) نەقلێ بووەو مولازم (جەلعووت) هاتوەتە جێ ی)).

(سورمێ) بە بزەیەکەوە :((ئەو مولازمە، چ مەردمێکە؟!)).

(مازن) هەڵیدایێ :((نازانم بڵێم چی؟! نازانم چۆنی بخوێنمەوە.. عارەبێکی ڕەشتاڵەی ورگزلی باڵا بەرز.. دەمێکی زلی هەڵتلیشاو.. لووتێکی هەڵقرچاوی خوار، هەمیشە ڕوویەکی گرژی پڕ چاڵ و چۆڵی بەسەریەکا ترشاوی هەیە.. قورقوڕاگەی خڕ وەك تۆپێکی بچووك، لە کاتی تف قووتدان و ئاو خواردنەوە دا بەرزو نزم دەبێتەوە.. کابرایەکە تابڵێی قین لە دڵە.. لە شەڕی عێراق و ئێران لە دەڤەری شارەزوور، برایەکی بە دەستی پێشمەرگەکانی حزبی سۆشیالیست و برایەکی لە شەڕی (قەسری شیرین) کوژراوە.. لە ئارەزووەکانی : زۆری حەز لە ڕابواردن و خواردنەوەی عارەقە)).

(سورمێ) بە دەم بزەیەکەوە:((کەواتە داوەتێکی نادی بکە و پێش وەخت عەریزەیەك بنووسە. لەوێ زانیت خەریکە مەست دەبێ، پڕو پوختە، عەریزەکەی بدەرە دەست)).

(مازن) لە جێوە تەلەفۆنی بۆکرد:((گەورەم.. ئەوکاتەت باش، چۆنی، چاکی؟!.. ئەحوالّت گەورەم؟!.. بەلّێ.. بەلّێ.. وەلاّ حەزدەکەم ئەمشەو لە نادی داوەتی منبی.. یەعنی بێم بەدواتا؟!.. باشە گەورەم.. باشە خوا حافیزتبێ)).

کە تەلەفۆنەکەی داخست : ((ئەوە ڕەزامەندی خۆی نیشاندا.. وا چاکە هەر ئێستە دەست بە نووسینی عەریزەکە بکەم)).

**********

پێشی مەغریب، بە سەیارەوە، چووە دوای.. بەیەکەوە لە یانەی شار ئۆقرەیان گرت.. سەرو پێکیان لەبەردەم دانان. مولازم (جەلعوت) بە دەم خواس و باسی دونیاوە، بوتلّە ئارەقەکەی هەلّپچڕی و پێکەکەی بەردەمی پڕکردو بلّندی کردەوە.. ڕایگرت.. چاوی تێبڕی.. پێکەکەی لەناو پەنجەکانی دا هێنایە سەما و هەولّیدا، لەناو دەمی ڕاگیری نەکردو بۆ خوارەوەی تووڕدا.. چاوی لە چاوی (مازن) بڕی :((پێش دەورەو تەسلیم، رائید کیفاح پێی راگەیاندم کە تۆ مرۆڤێکی دلّسۆزو شایستەی.. دەکرێ لە تەنگانە، پشتت پێ ببەسترێ و هەر هاوکارییەکت بەخەسار ناچێ)).

مولازم (جەلعوت)، وردە وردە مەست دەبوو.

(مازن) چاوەکانی هەلّپرواند.. عەریزەکەی بەر باخەلّی دەرێناو بۆی ڕاگرت ((فەرموو گەورەم)).

مولازم (جەلعوت) سەری گرم داهاتبوو.. عەریزەکەی لێ وەرگرت، سەری بەسەردا شۆڕ کردەوە.. کەوتە خوێندنەوەی.. لەوەوە، وەکو هەوڵێك بۆ مەرامەکانی، بە ناخی خۆی دا شۆڕبۆوە.. مت، چاوی تێبڕی، دەای تاوێکی کورت :((ئەم داخوازییە، ئاساییە، وادەکەم بە زوویی جێ بە جێ ببێت، بەڵام منیش مەرجێکم هەیە؟!)).

+ فەرموو هەر مەرجێکی جەنابتان بیڵێ ی.

- چ خوشکت هەیە؟!.

+ بەڵێ خوشکێکی تاقانەم هەیە،(وەعدی) ناوە، شووی کردووە و منالّی نیە.. پیاوەکەی ماوەیەکە بە ڕووداوی سەیارە ڕۆیشتووە.

- خوا عەفووی کردووە. خوشکەکەت عەرەبی دەزانێ.

+ نزیکەی حەوت ساڵ لەگەڵ پیاوەکەی دا بۆ کاسبی ماڵیان بردبوە پارێزگای (سەماوە). عەرەبیەکی باش دەزانێ.

- دەتوانی وابکەی: سبەی ئێوارە بێتە میوانیم؟! خۆت دەزانی، ئەوە دوو هەفتەیە لێرەم.. تەنها بۆ شەوێك پێویستیم پێیەتی.. دڵنیابە نوسراوەکەت، بە جۆرێ دەنووسم کە بەگەیشتنی، ڕاستەوخۆ ڕەزامەندی وەوە بگرن.. بەڵام تۆش ئەم مەرجەم، بێنە دی.

(مازن) تەزوێك، لە تەوقی سەریەوە دەستیپێکرد و لە بنی پێی، دەرچوو.. ئارەقەی پێ ڕشت.. ماوەیەك داما، وەلێ هیچ ناڕەزاییەکی دەرنەبڕی :((باشە من رازیم)).

ئەویش ملی کەوان چووی بەززکردەوە، وەکو راستەی لێهات.. دەستی گەیاندە قەڵەمەکەی گیرفانی و هامشێکی لەسەر نووسی..

کاغەزەکەی دەق و نووشت کرد.. هەڵیگرت.. بە لەسەر خۆییەکی پتر لە پێویست، وتی:((لە ئەمڕۆوە تا هەفتەیەك، دوو هەفتەی تر، چاوەڕوانبە و وابزانە فەرمانەکەت گەڕاوەتەوە)).

**********

شەوی کپی هەواو سەفا، (مازن) ی لوولدا، هەستی کرد سەری قورسە، وەك سەنگێکی قورقوشمین لە گریێ ی ملی شۆڕکرابێتەوە.. بە خاویەوە لەسەر سیسەمەکە ڕاکشا.. (سورمیێ) لە قولایی خەودا بوو، هەستی بە هەناسەی دەکرد.. گەلێ بیرو ئەندێشەی بۆ هات.. خەم و پەژارەی لە ناخا کەلەکە بوو بوو.. بەدەروونی پڕ لە شکۆوە، دەتوت: دێوە زمەی مەرگ، دەستی لە بینە قاقای ناوەو سەمای مەرگی پێدەکا :((باشە دەبێ شەوێك بۆ موستەشاری چی بێت؟! چۆن قەناعەتی پێبێنم؟! واچاکە، بە قسەی خۆش حاڵیکەم کە بەرپرسی تازەی منەزەمە دەیەوێ لە لێکۆڵینەوەیێکی وردا، لاپەڕەی رابردووم هەڵداتەوە و بۆچوونەکانی تۆ بەهەند هەڵدەگرێ، پاساویشیان ئەوەیە: ئافرەت میهرەبانە، درۆ نازانێ.. تکای لێ دەکەم پێی دەڵێم : گەر خاتری منت دەوێ؟!.. گەر منت خۆش دەوێ؟ دەبێ ئەو ئەرکە لە ئەستۆ بگری.. دوای گەڕانەوە و سەرکەوتن تیایدا، ئەوەی دەتەوێ.. ئەوەی داوای دەکەی، بۆتی دێنمەدی.. خۆ ئەگەر ئەگەر نەهاتە ژێر بارەوەو لاتجێمی کرد، وتی:(نایەم) و بۆ قەناعەت پێهێنانی هیچ ڕێگەیەك نەما.. ترشبێ و تاڵبێ، بە ناچاری دەبێ پەنا ببەمە بەرچاو سوور کردنەوە و هەڕەشە کردن لێ ی)).

**********

بەیانی تازە گزنگی دابوو، لە ناو نوێنە گەرمەکەی دەرچوو.. هەستی بەشەکەتی کرد.. باوێشکێکی قووڵی دوای خەوێکی درێژی دا، خۆی لەسەر پێ نەگرت.. بەربۆوە. کەتەکانیدایە بەرخۆ، بەرەو دەستشۆرەکە رۆیشت.. بەرچایی کرد.. ملی رێی بەرەو ماڵی (وەعدی) گرتەبەر.. (وەعدی) وروکابووەنان کردن.. گونتکەکانی بە تیرۆگ پان دەکردەوە، هەر خۆی لەسەر سێلەکەدا ئەم دیوو ئەو دیوی دەکرد.

(مازن) بەدەم بزەیەکی بە مەغزاوە، رووی تێ کرد:((هۆ تاتە گیان، ماندوو نەبی؟!)).

سێڵە مۆرەوە بووەکە و ئاگری داری ژێرەوەی، لا روومەتی گوڵڕەنگ کردبوو:((ئەی خوا عەفوتکا یاڕەبی)).

(وەعدی): ئافرەتێکی بالاّ بەرزی، گوشتنی، قژ زەردی خەناوی.. جووتێ لێوی نەباریکی نەئەستوور، تەنیا بۆ مژین دانراو، لووتێکی قوتی رێك لەگەڵ جووتێ روومەتی سپی و سووری تێکەڵاو، بە سێوی لاسوورە دەچوو.. بە کردار و رەفتارو سەرو زمانی، هێور و ئاغرو سەنگین بوو.. بە پێکەنینەوە:((ها کاکە مازن، خێرە بەو بەیانیە، رێت هەڵە کردووە؟!)).

(مازن) پەشۆکاو:((چ.. چ.. چی؟! ئەوەی راستی بێ ئەم بەیانیە جەرگ و هەناوێکی باشم کڕیوە.. حەزەکەم ئەم نیوەڕۆیە، میوانمانبی)).

(وەعدی) کەمۆکەك داما.. بە دەنگێکی سۆزناکەوە:((بە زیاد بێ.. پێم ناکرێ.. دەترسم کەتنێکت لە بن سەربێ)).

+ کەتنی چی؟! تەڕەماشی چی؟! هەر حەزدەکەم، ئەگینا.. وەلحاسڵی کەلام: دەبێ هەر بێی باشە؟! ئەوە من ڕۆیشتم.

– باشە، با دەستم لە نانکردن بەربێ.. وردە وردە بەرەوماڵتان شۆڕ دەبمەوە. (مازن) هەیپێی لێکرد و بەرەو فەرمانگەکە ملینا.. لە ڕێگادا، پێڵاوەکانی بە جۆرێ لە شەقامەکە دەسووی، وەك بیەوێ رووی بڕوشێنێ و ئازاری بدات.. دەستی گەیاندە چڵە دارێکی سەر شۆستەکەو لێی کردەوە.. بەدەم رۆیشتنەوە، لقەکەی دەشکان و دەیپڕواند.

**********

نیوەڕۆ، گەڕایەوە.. بە هاتنی (وەعدی) دڵخۆش بوو.. خۆی گۆڕی.. هاتە نزیکی.. لەبەر یەکەوە، قسەی خۆشیان بۆ یەکدی دەکرد (سورمێ) بەو دیمەنە، دڵگران بوو.. هۆڵەکەی جێ هێشت. (مازن) روخسارێکی گەش و گوڵگونی لێناو مەبەستی بانگکردنەکەی بۆ درکاند و (وەعدی) ئەوەی قسەیە، لە دەمی دەرنەچوو.. ئەویش مات و ئەو هەڵوێستەی بە ئاسایی زانی و سوودی لە کاتە مەییوەکەی نێوانیان وەرگرت.

(وەعدی) زاری دەمی هەڵپچڕی :((کاکە، مەسەلە تەنها پرسیارو وەڵامە، ئەوە چ کێشەیەك نیە و دەچم.. بەڵام نازانم، دڵم وانالێ و ختورەی ئەوەم بە دڵ دادێ : ئەم شتە شتیتری بە دواوە بێ.. بەبرای خۆم بڵێم : من زۆر لەو سەگ و سوارانە، دەترسم.. بە

بیستنی ناویان، مووچڕکەم بە لەش دادەگەڕێ.. دیسان دەیلێمەوە : لەبەر چاوی تۆ، قەیناکە دەچم، بەلاَم لەوە زیاتر، ئەگەر لەسەریشمدەن، لەو چەند سەعاتە بترازێ، لەوێ نامێنمەوە.. حەزیش دەکەم، منالێکم بەگەرخەیت)).

+ نا.. چ خەمت نەبێ.. من خۆم دەتبەم و هەر خۆشم دێم بە دواتا.. وەك وتیشم رەنگە لە سێ چوار سەعات زیاتر نەبێ.. وریابە،پرسیار بە پرسیار ۆرینی پرسیار، دووبارە لە پرسیارکردنەوە یان نەشلەژێی.. دەمەوێ لە ئاقاریان بێتاقەتی رووت ێنەکا.

کە هەناسەێکی ئۆخەی، هەڵمژی.. راست بۆوە، چووە ژووری نووستن کە تەلەفۆنەکەی هەڵگرت، دوو لێوی وشکبووی هەڵێنا :((گەورەم چۆنی؟! ئەحواڵت.. گەورەم ژنەکە ئامادەیە، سەعات نۆی شەو، دەیهێنمە لای جەنابتان.. وەلێ زۆرم هەوڵدا، بۆ مانەوەی لەو شەوەدا، بەلاَم زۆر کەلە ڕەقە و نایەتەسەر، دەڵێ:(نیوە شەویشبێ، دەگەڕێمەوە) بۆیە هەر چارەیەکی بەڕێزتان پێیباشبێ.. سەر پشکبە.. بەڵێ.. گەورەم، ئەوە بۆ تۆی جێ دێڵم، کەیفی جەنابتانە، باشە بەسەرچاو.. خواحافیزت بێ)).

**********

سەیارەکەی هەڵکرد.. کاتژمێر نۆی شەو بە چارەگێك، (وەعدی) لەگەڵ خۆی سوار کردو بردیە ئەو خانووە سەر بەخۆیەی تەنیشتی منەزەمە، کە مولازم (جەلعوت) بۆ خۆی، بە کرێ گرتبوو.

خوشکەکەی پێناساند:((ئەمە وەعدی خوشکمە)).

ئەویش بەرەو پیریەوە چوو:((پێخۆشحاڵم.. یا خوا بەخێربێ ی.. فەرموو دانیشن)).

(مازن) بە زەردەخەنەیەکەوە :((گەر ئیجازە هەبێ، من دەڕۆم، پاشان دەگەڕێمەوە)).

- باشە بەخێرچی.

مولازم (جەلعوت) لە دۆلکەی سەرمێزی نێو هۆڵەکە، گلاسێك ئاوی بۆ هێنا، کە دوو دەنك حەبی خەوی خستە ناوی و بۆی راگرت:((فەرموو ئاوێك بخۆوە)).

(وەعدی) تەزوێکی پیاهات، دڵ و جەرگی لەگەڵی دا هەژا و دەستی بۆ گلاسەکە درێژ کرد:((زۆر سوپاس.. ئەزیەت بوو)).

بە چەند قومێ، ئاوەکەی هەڵقوڕاند.

ئەویش بە دەم بزەیەکەوە :((گەر ئیجازەم بدەی.. پێش هاتنی تۆ، تەلەفۆنم بۆ کرا.. هەندێ کاری گرنگ هەیە.. جەنابت لێرەدا سەربەستی و ئازادی خۆت وەرگرە، تا دەگەڕێمەوە)).

بە هەنگاو هەڵێنانەوەیەکی کورت و لەسەرخۆ، بۆ دەرەوە رۆیشت.. لە دوای خۆیەوە، بە ئەسپایی دەرگای دەرەوەی کلیل دا، (وەعدی) تاوێکی باش، بە ملاو بەولای ڕوانی.. کەوتە چاو گێڕان.. هەستی کرد : خەواڵو، مێشکی گێژ دەبێ و چاوی گرانداهات.. سەری کە نەفتی نایە سەر دەستی چەپەی، خەوبەلایدا بردو خەوی لێکەوت.

**********

کە بەیانی بە ئاگا هات، چاوی رێشکەو پێشکەی دەکرد.. کە خۆی لەسەر قەرەوێڵەکە بە رووتی بینی.. لەشی وەك کەڵەشێری

سەربڕاو هەڵفڕی.. زمانی گۆی نەگرت و لە کلیلە چوو.. دایە پرمەی گریان، جلەکانی وەکو رەشەبایەکی فێ لێهاتبوو کردەوە بەرو بۆ دەرەوە دەرپەڕی.. لەسەر جادەی سەرەکی، سەیری شەقامە جەنجاڵیەکەی لای راستی کردو چاوی بە شەقامە بچووکەکەی لای چەپە، زاخاودا.. ئەوجا دەستی رووەو ماڵ لەبەریەك لە تەکسیەکان ڕاگرت.

**********

(خەجیج) ی دایکی، ئەو شەوە خەونی پێوە بینی.. بەیانی کە لە خەو ڕاپەڕی، ترسێکی گەورەی لێ نیشت.. ترسێك، گومانی ئەوەی لاڕسکاند (وەعدی) تووشی کارەساتێکی دڵتەزێن بووبێ.. هەر دوای نانخواردن، سەفەری کرد.. کە لە گەراجی شار دابەزی.. دەمێك بوو، نەزری لە خۆ کردبوو مەکسیەکی بۆ بکات، مەکسیەکی جەلەبی کڕی، بە شەقاوە سست و لەسەرە خۆکەی، بەرەو ماڵیان، لە شەقامە گشتیەکەوە، خەیالاَوی، خاوو خلیچك هەنگاوی نا.. لە هۆڕنی یەك لە سەر یەکی گازێکی دوو تەنی، ڕاچەنی، بە تووڕەیی و دەمی پڕ جنێوەوە، ئاوڕی دایەوە.. هێندە بە پێ ئەو ڕێیەی کوتاوە، تەنگە نەفەس بوو بوو.. بە نزیك بوونەوە، چڕە دووکەڵێکی چڕو خەستی بەرچاو کەوت، لە ماڵی (وەعدی) بەرز دەبۆوە، حەشاماتێکی بێشوماریش لە چوونە ژوورو هاتنە دەرەوەدا جمەیان دەهات، داچڵەکی.. هەنگاوی ناو لە پڕ هەڵوێستەی کرد.. چاوی بەو دیمەنە ئەبڵەق بوو کە ئەو خەلکەی دەبینی بە قازمە و شانسی خەریکی شکاندنی دەرگای گەرماوەکەن.. وەك لەسەربان بەریان دابێتەوە،

کەوتە سەر زەویەکە.. بوورایەوە، نەختێ ئاویان بە دەموو چاوی داکرد، کسپەی ئازارێك لە ناخی دا برژاندی و بەدەم خەمە دڵ پڕ وێنەکەیەوە:((ئەوە چیە؟!)).

مێر منداڵێکی دوانزە ساڵی، ڕەپ و ڕەوان، هاتە وەڵام :((باجی وەعدی دەرگای حەمامی لەسەر خۆی شیش دابوو.. دەبەیەك نەوت بەسەر خۆی دادەکا و بە دەنکە شقارتەیەك، ئاگر لە خۆی بەردەدا.. تەرمەکەی بووە خەڵوز )).

(خەجیج) هەردوو لێوی، تەتەڵەی دەکرد.. حەپەسا.. وشك هەڵاتوو، کەوتە پرچ ڕنینەوەو سینگ کوتان:((وەی کچە خێر لە خۆ نەدیوەکەم.. وەی.. وەی.. جەرگی دایەو بابێ)). کە مەکسی نێو نایلۆنەکەی دەرکردو رای وەشاند:((هۆ کچە چاو مامزەکەم، چاو هەڵبڕە، ئەو مەکسیەم بۆ هێناوی.. بۆ بە جێتهێشتین؟! داکت بمرێ، داکت لە دەورت گەڕێ وەی، وەی.. وەی کچە خێر لە خۆ نەدیوەکەم)).

(مـازن) خـۆی وا نیشـان دەدا، کـە بـەم کـارەی خـۆ سـووتاندنی (وەعـدی)، دڵتـەنگ و پەرێشـانە.. بـە خەمبارییـەوە، دەیـوت:((ئـەو خوشکەی من ئەوێ ڕۆژێ، نیوەڕۆیەکـەی داوەتـی ماڵمـان بـوو.. زۆر بەکەیف خۆشی، کاتمان بەسەر بـرد.. ئێسـتاش هەسـتم نـەکرد هـیچ نیشانەیەکی سـەر سـوڕمانی لێ بـەدی بکـرێ.. کێشـەیەك، گرفتێکـی هەبێ.. بەڕاستی لەو خۆسوتانەی ئەو، سەرم سوڕماوە.. گومانم نیە، کەس لە گوڵ کاڵتری پـێ وتبێ یالێرەو لەوێ قسەیەکی ڕەقـی لەگـەڵ کرابێ )).

(خەجیج) هەفتەیـەك لـەماڵی مـازن مایـەوە، لـە تەلەفۆنێکدا کـە (مازن) هەڵی گـرت :((بـەڵێ.. ئـا، گـەورەم ئـەوە تـۆی؟! فـەرموو.. بەڵێ.. کەسە نزیکەکانم؟! تـەنها دایکـم و خێـزانم لێـرەن.. فـەرمانی مووستەشاریم دەرچـوو؟! بەڕاسـتی دڵخۆشـم.. سوپاسـت دەکـەم.. بەڵێ.. بەڵێ.. هەردووکیان.. هەر ئێستا دێین)).

بزەیەکی لەسەرو سیما دەرکەوت و شادیەکی بێ سنوور گەمارۆی دا.. کە هەواڵەکـەی پـێ وتـن :((دەی، دایـە گیـان، دەی، سـورمێ.. خۆتان ئامادەکەن تا منەزەمـە دەچـین.. دیـارە دەیانـەوێ، لـە ڕێـو ڕەسمێکی شایستەدا، ئەو شەڕەفە گەورەم پێ ببەخشن)).

هــەردووکیانی، بــردە منەزەمــە.. یــەك لــە کارمەنــدانی ئــەوێ بەڕێزەوە:((فەرموو.. فەرموو لەو ژوورەی سەرەوە دانیشن)).

ژوورەکە: جگە لە تاقمی قەنەفەو وێنەیەکی لە جامدراوی سەددام، تەلەفزیۆن و ڤیدیۆیەکی تێدا بوو.. (سورمێ) کەوتە چاو گێڕان، وەلێ

شتێكی نەدی سەرنجی ڕاكێشیَ.

مولازم (جەلعوت) بە خۆو دوو چەكدارەوە، پەیدا بوو.. شریتێكی بە دەستەوە بوو.. لە دوورەوە : بەخێرهاتنی كردن و تەوقەیێكی گەرم و گوڕی لەگەڵ (مازن) كرد:((پیرۆزە.. پیرۆزە)).

شیرینی دابەش كرا.. شەربەت خوراوە.. پێش هەڵسان و ڕۆیشتنیان، مولازم (جەلعوت) شریتەكەی بەرز كردەوە :((خزمان : حەزدەكەم پێش لێدانی ئەم شریتە، ئەوەتان پیَ ڕابگەیەنم، ئەم شریتە نهێنیەكە، ئەمانەتێكە، لای ئێمە.. كەس نایزانیَ و ئێمە پارێزگاری لیَ دەكەین.. دوای لێدانی ئەم شریتەو، بە چاو پێكەوتنی سەرسام مەبن.. مەبەست لەمەدا ئەوەیە رەفیق (مازن) بەرامبەر بەم حزبە وەك ئەو ئەمانەتە، دەبیَ دڵسۆزو وەفادار بیَ و پارێزگاری لەو پلەو پایە بكات كە حزب پیَ ی بەخشیووە)).

تەلەفزیۆنەكەی هەڵگرت.. شریتەكەی خستە ناو ڤیدیۆكە.. چ ببینن؟!.

ئەو دوو زەلام كەوتونەتە گیانی بێئاگای وەعدی و خەریكن لەگەڵی دا ڕادەبوێرن.. ئەو دیمەنە سەری شەرمەزاری بە(مازن) شۆڕ كرد.. ئاخێكی تاڵ لە قوڕگیا گیرسایەوە. (سورمیَ) وەك خۆی لە گێلی بدا، لە ژێرەوە، پتر لەو دیمەنە ووردبۆوە و تەماشای دەكرد. (خەجیج) چاو ئەبلەق، بوومە لەرزەی هاواری (مازن) ی ڕاچڵەكاند، تەكانی دا هەڵیَ، چۆكەكانی نەبزوتن.. دەنگی بە سینگ كێشان و چریكەی تووڕەیی تێكەڵ بەیەك بوو بوو.. وەكو شێتی لێهات.. دارِسا، پەلاماری مولازم (جەلعوت) بدا، پاسدارەكان لە دواوە

گرتیان.. هێندە هات و هاوار و دەستی بە گریان کرد، نـوتقی گـیرا.. نوتقی نەبۆوە.. دکۆر نەما نەیبەنـە لای.. چ شـەخس و پیـاو چـاك و سەید و مەلا نەما، سەردانی نەکەن.. چاك نەبۆوە.

(مازن) هەر جارێ، بە چەند چەکدارێکەوە دەچووە ماڵی باوکی.. (خەجیج) بە بینینی، خۆی گرژ دەکرد.. دەچووە بار یەك.. تووڕەیی و بێزاری، سەری لێهەڵەدا کە ئاگری لە ناوچـەوان ببـارێ.. دەکەوتـە ئیشارەتدان، وەك بڵێ :((دەی حەرامزادە، لە پێش چـاوم نـەمێنی.. کوڕم (ئامانج) ئەو کوڕە زۆڵە دەرکە و لێمی دوورخەوە)).

(ئامانج) بە هەڵپەیەکەوە، دەیوت:((هۆ دایە : بۆ ڕقـت لێیـەتی؟! ئاخر ئەمە کوڕتە.. جەرگتە و بەشێکە لە تۆ)).

کە ڕوی دەکردە (مازن) :((کاکە گیان، ئەوە چیت کردوو وا دایکم لێـت بـە ڕقـا چـووە؟! لـەوە دەچـێ شـتێ ڕوویـدابێ و لێمـانی دەشاریەوە)).

(مـازن) ڕەنگـی زەرد هەڵگـدەڕا.. تاسـەیەك دایـدەگرت.. گیـانی دەکەوتە سەر ئاو ئارەقە.. شڵەژاو، بۆ ئەوەی رووە پەشـۆکاویەکەی بشارێتەوە، سەری بادەداو بە تەوسەوە:((ئامانج : بەڕای تۆ من چیم کردبـێ باشـە؟! بـەڕای ئێـوە نهێنـی هەیـە و ێتـانم شـاردبێتەوە؟! باوەڕم پێبکەن هـیچ شـتێ لـە خـۆم شـك نابـەم.. سـەیرم پێـدێ، وا دایکەم بەم شێوەیە لێم چووەتە ڕق و لێم داخدارە)).

**********

ورده ورده لای (مـازن) نـرخ و بـەهای مرۆڤایـەتی بـووە پـارەو پوول.. بووە پلە و پایە.. پەیوەنـدی خزمایـەتی بـە جـارێ پچـڕاند،

تەنانەت لە هامووشۆو سەردانی ماڵە باوکی دا، ساڵی جارێك دەچوو، ئەویش نەك دانیشتن و مانەوە، بەڵکو بە قەد جگەرە کێشێك، بە پێوە دەوەستاو ئیتر دەگەڕاوە.. ئەو مرۆڤەی پێشان لە هەفتەی جارێ لە دوو هەفتە جارێ، گۆشتی لە ماڵ دەخورا، ئێستا هیچ جەمێ بێ گۆشت هەڵناکاو بێزی نایەت هەموو خوادنێك بخوا.. کاتێك لەبەردەم خانووەکەی دەوەستا، ئەگەر بیبینیایە : کەسێك بەو دەرە رادەبووری و چاوی دەداتێ.. بە ئیشارەت بانگی دەکرد:((وەرە کابرا.. وەرە پێش)).

هەردوو دەستی، راست و چەپ دەکرد چاوی ئەبڵەقی تێ دەبڕی:((وەرە بزانم شتێکی نامۆت بینی، وا چاوت زەقەکەیەوە؟!
پێم بڵێ: شتێ هەیە و ئێمە نایزانین؟!)).

ئەگەر کابرا بێ دەنگ بوایە، یا داوای لێبووردنی بکردایە.. لەسەرخۆ پێی دەوت:((جارێکیتر، بەو ڕەنگ و بۆیەت نەبینمەوە)).

ئەگەر ئەو کەسە بیدایەتە لاملێ، ئەوە تا هێزی دەبەرابوو، زللەیەکی دەخەواندێ و چاوێکی لە حیمایەکانی دادەگرت :((دەی بڕۆن لەشیم بۆ نەرم کەنەوە)).

ئەوانیش بێ بەزییانە بەردەبوونە وێزەی.. خۆ ئەگەر ئەو کەسەی لای خۆدا گلبدابایە، دەبوو کەس کاری کابرای گیراو بە دەست و دیاریەوە بێنە پێش.

**********

ئێوارانێکی سەرەتای وەرزی بەهار : زەردەپەڕی ئاسۆ، لێڵ بوو.. ئافرەتێکی جوانکیلەی شۆج و شەنگ، بە بەردەمی ماڵیان، دادێ..

ئافرەتەکە خڕو خەپانی نەرم و نیانی ڕەنگ و ڕووگەشی نەشمیلەو ئاو دامەن، ئێسك سووکی و شیرینی و ناسکی لێ دەباری.. یەك لە حیمایەکان، دەمی دێنێتە بەر پەڕە گوێچکەی (مازن):((قوربان، ئەو ژنە پیاوەکەی پێشمەرگەیە.. دەڵێن هەر مانگێکە ماڵی هاتۆتە ئەم گەڕەکە.. بە ڕاستی تەڕە)).

(مازن) بە چاوێکی پڕ لە هیواوە، بینایی بەسەرو روخساری داگیرا، بگرە سەرنجی بەرەو خواریش بۆ لەش و لاری داگرتە خوارێ و وێنەیێکی ئەوانیشی گرت :((هێ ی، ژیکەڵەخان: تا ئێرە نایەی؟!)).

ژنەکە لە جێوە چەقی و بە هەڕەشەوە :((ها.. چتدەوێ؟! چ ئیشت پێمە؟!)).

(مازن) دووبارە، چاوە برسیەکانی لە روخسار و بەژن و بالای بڕی:((زانیومە، ماوەیەکی زۆرە لە پیاوەکەت دابڕاوی.. گومانیش لەوە دانیە، بۆ ئەو شتە بە حەوا دادەچی و تامەزرۆی.. گەر ئاوڕێکمان لێ بدەیەوە، خێرت دەگا)).

ژنەکە تا هێزی تیا بوو، تفێکی تێگرت :((هەی گەوادی بێحەیاو بێناموسی بێ شەڕەف )).

(مازن) سەری بەسینگی دا شۆڕ کردەوە.. خامۆش بوو.. ماوەیەك بێ وورتە و جووڵە.. بەو چەشنە مایەوە.. نقوومی خامۆشیەکی پڕ خەمۆکی بوو. ژنەکە، هەمدیسا کەوتە هەڕەشە کردن :((بڕۆنێ.. بڕۆنێ.. چاوی چۆن بەرداوەتەوە.. بۆ نابیتە دڵۆپە ئاوێك

و زەوی قوتت بدا. بەلآم زەمینیش نەفرەتت لیّ دەکاو ئامادەنیە، لە ناو دلّی خۆی، بتشاریّتەوە)).

(مازن) سەری پڕ کاسی بـەرزکردەوە :((خۆشـیبیّ و ناخۆشـی.. تۆ پیاوەکەت موخەڕیبە.. گەر لە ژێر فەرمایشتی ئیّمە دا نەبی، لەم شارە جیّت نابیّتەوە.. کیّوە دەچی؟! ئەمشەو هەردیّمەلات..، ئەوجا پیاوەکەت، بابیّ ئەم ئەم ولآتە و تۆ لە ژیّر رەحمەتی من رزگارکا)).

ژنەکە قورگی پڕ گریان بوو.. چاوەکانی فرمیّسکی تیا قەتیسما.. بە حیرسەوە پشتی، تیّ کردو خۆی بە کۆلآنە تەنگە بەرەکە دا کرد.. ئەویش تا لە کۆلآنەکە وون بوو، چاوی لیّ نەتروکاند.

وەك دەگیّڕنەوە: ئەو ژنە لەترسی شـەرەف وناموسـی خـۆی هـەر ئەو کاتە مالّەکەی جیّ دیّلّیّ و ئەو ڕۆیشتنەی ڕۆیشت، کەس نەیزانی، چی لیّهات؟!.

پیاو، دایە بێئەخلاقی، بە کەس نابەسترێتەوە و ڕاگیر نابێ..
(مازن) شەوانە بە تۆی حیمایەکەوە.. زۆر جاریش، وادەی جێ ژوانی لەگەڵ ئەو ژنە سۆزانیانە رێك دەخست کە تایبەت بوو بە مەسئوولین. بەمە هەندێ جار، نیوەی شەو.. هەندێ جار، دەمە دەمی بەیان دەگەڕاوە.. (سورمێ) بەو پەڕی دڵپڕییەوە، لێی دەپرسی:((پیاوەکە، دیارە تۆ لە خۆت ناترسێی وا بەو درەنگیە دێیەوە.. خوانەکە.. گوێ ی شەیتان کەڕ بێ، هەزارو یەك موقەددەرە، ئەگەر خوا نەناسێ تەقەی لێکردی و دەستی وەشاند)).
ئەویش بە هەڵپەیەکەوە:((دڵنیابە.. من بە شوێنێ تێناپەڕم، مەترسی بۆم هەبێ دوای ئەوە ئیش و کارەکەمان وایدەوێ، بە دەست من و تۆ نیە فەرمانە و هیچ گفتوگۆیەك هەڵناگری، تێگەیشتی گیانەکەم؟!)).
(سورمێ) بەم وەڵامە سەری بادەدا :((باوابێ، بەڵام چۆن دەزانم خوا بەهەقە، ئاواش دەزانم، ئێستا لەو ماڵە قەحپە بێ ئابڕوانە خۆت تێر کردووە، ئەوجا هاتویتەوە)).

**********

شەوێکیان، بە تەنها دەچێتە دەرەوەو.. ئەو چوونەی رۆیشت، نەگەڕایەوە.. بەیانی داهات.. هیچ سەرو سۆراغیان، لەمەڕ نەزانی.. گەڕان و سوڕان، بە ناو دام و دەزگا حزبی و حوکومی و برادەرو

ناسیاو.. کەس نەیوت :((من ئەو شەو دیومە، یا قسەی لەگەڵ کردووم)).

کاتێك دوو پۆلیس، دێنە ماڵیان.. (سورمێ) لە دوورەوە، دڵی دەخورپێ:( مازن چی لێهاتووە).

یەك لە پۆلیسەکان، بە خەمبارییەوە :((باجی.. چت لێ بشارینەوە، هاتووین بە دواتا پیاوەکەت بە کوژراوی لە ناوەڕاستی جادەی سەرەکی دەرەوەی شار دۆزراوەتەوە)).

سیسارکە کەچەڵ کۆمەڵ کۆمەڵ، دەوریان لە لاشەکەی دابوو.. هەڵیان دەکۆڵی و وردە وردە گۆشتەکەیان دەخوارد.. دەنگی قەڵە ڕەشکەش، لە ئاسمانەوە دەهات.

مولازم (جەلعوت) لە هەڵدانەوەی فایلی نەیارانی (مازن)، دەستی تاوان بۆ (عەزیز) و (مارف) و (صدیق) درێژ دەکاو دەم و دەست مەفرەزەیان لە دوو دەردەکات.. ئەو بزربوونەی ئەوان بزرکران، ئێستاشی لەگەڵدابێ، کەس نەیزانی، چارەنووسیان بە چی گەیشت؟!.

هەندێك دەڵێن:((هەرسێکیان بردراونەتە ئەو شوێنەی تەرمەکەی (مازن) ی لێ فڕێ درابوو.. لەوێ بەیەکەوە گوللەباران کراون، پاشا ن بە شارەوانی ڕاگەیەنراوە کە ئەو تەرمانە زۆر بە نهێنی تەقەتکەن)).

هەندێکیش دەڵێن:((دوای بردنیان بۆ ئەمنی عامە، هێندە ئازار دراون، سەر ئەنجام لە ژێر ئەشکەنجەدا، گیانیان لە دەست داوە)).

**********

(حەمەلاو) بە هەفتەیێك پێش كوژرانی (مازن).. لە گەڕانـەوەی بـۆ ماڵێ.. بێ دەنگی: باڵی بەسـەر ژوورەكـەدا كێشـابوو.. بـە دەم وەڵام دانەوەی دەیەها پرسیار.. پیاسەی دەكرد.. دەهات و دەچوو سەری بادەدا:((حەیفێ و هەزار مەخابن.. دونیا بۆ ئاخر زەمان نیە؟! دونیا چۆن سەرەو ژوور نابێ.. نە پیاوەتی ماوە، نەغیرەت، نەشەڕەف)).

(ئامانج) بە پەنجەكانی، قژی داهێنا :(( باوكە گیان، تۆ قەت بـەم شێوەیە رەش بین نەبووی.. ئەوە بـۆ وا خـەمباری؟! چـی بـووە؟! چی ڕوویداوە؟!)).

(حەمەلاو) لچە شۆڕەكەی تۆزێ بزوانـد و بـە تووڕەییـەوە :((مـن لەم كەین و بەینە بێئاگا بووم.. دەبوو.. هەڵبەتـە بمزانیایـە.. ئـەمڕۆ لەگەڵ خاوەن تەكسیەك سوار بووم.. قسەو باسمان لەسەر بێڕەحمی مرۆڤەكانی ئەم سەردەمە و زوڵم و زۆرداری بوو.. كاتێك بە تەنیشـت ئەو دایرەی ڕژێم تێپەڕین.. شوفێرەكە بزەیەكی هاتێ، وتـی :(خاڵـە گیان، گوێبگرە قسەیێكی خۆشت بـۆ بگێڕمـەوەو كـە تـا ئێسـتا، ئـەو یەكـەم جـارە دەیـدركێنم.. بەیانیـەكی زوو بـوو، لـە تەنیشـت ئـەو دایرەی بە بەردەمییا تێپەڕین، ئافرەتێكی كەڵەگەتەی جوان دەستی هەڵبڕی.. سەیارەكەم بۆ ڕاگرت.. سوار بوو.. هەنسكی دەدا، منـیش بە دەم خۆ ئامادەكردنەوە، چەند پرسیارێكم گەلاڵە كرد، وتم:((ئەرێ خوشكی بەڕێز : هەرچەندە بۆ من بێ ئەدەبیـە دەسـتكاری لـە كـارو بـارت بكـەم.. پێدەچـێ شـتێك قـەومابێ؟! هـیچ بـووە، بـەم جـۆرە هەنسك دەدەی؟!)) ئافرەتەكە بـیری مانـدووی تـەزی بـوو.. سـەری هـەڵبڕی و وتـی:(مـن برایـەكی گـەوادم هەیـە، نـاوی مازنـە.. رەفیـق

حزبیه.. بەناوی لێکۆڵینەوە و پرسیارو پرسیار،منی لە خشتە برد.. قەناعەتی پێهێنام، بچمە لای ئەو سەگ و سوارو گەجەرو گوجەرانە.. ئەوانیش ئەوەی خراپە پێیان کردم ) منیش وتم :(ناوت بەخێر؟!).. وتی : (وەعدی).. وتم: خوشکە وەعدی : ئێمە لە زەمانێکداین، برای وا هەیە بۆ هەندێ بەرژەوەندی خۆی، نەك هەر خوشکی.. بگرە دایك وعێل و عەشیرەتەکەشی دەفرۆشێ)).

شۆفێرەکە نەیزانی ئەوانە کچ و کوڕمن.. سەری پڕ کاسم بۆی لەقاند.. بە ناڕەزاییەوە لە دەمیم دا :((کاکە، خۆتۆ من ناناسی؟! بەڵام بزانە دیوار بە گوێ یە.. خوانەکە ئەو قسانە بە خاوەنی گەیشتەوە، هەڵوێستی تۆ چی دەبێت جگە لە گرتن، ئەوجا کوشتن و هەڵواسین؟!. ئەم قسانە ڕووی مەجلیسان نیە.. خەڵك کە گۆڕاوە، نابێ دڵت ساف بێ و ئەوەی گەیشتیە لای مەرامی دڵتی پێ بڵێ ی : من حاجیم.. لە خوا ترس و گەڕاوە، حەق نی یە، مادام نامناسی، قسەیەکی وا بکەیت.. تازە ئەوەی لای منت باس کرد، با هەر لێرە بێ و بەس.. نەکەی بۆ خێزانی خۆشتی باس بکەی)).

شۆفێرەکە، سەری سەرسامی وەرچەرخاند :((بەخوای ڕاستەکەی.. زۆر پەشیمانم لەوەی ئەو ڕووداوەم بۆ تۆش باس کرد.. هەر چەند شتەکە ڕاستیە، بەڵام ئێمە لە کەش و هەوایەك دەژێین، ڕاستیەکان بزر بووە)).

ویستم یەکسەر بچمە ماڵی (مازن) و بچم بە گژیا، شفت و شۆی بشکێنم.. وەڵێ، لێوی خۆم گەست، وتم:((چەندی بە چەند، ئەگەر شەقازیلەیەکم لێداو لێمهەڵگەڕاوە، یا قسەیەکی ناشیرینی پێوتم؟!

قسەیەك بۆ من، بە گوللەیێك هەیە.. ئەوەی بـە قسـەیەك نـەمریێ، بـە خەنجەرێك نامرێ. بەلاّم پەیمانم لەگەڵ ناخی خۆدا گرێدا، کە تامـاوم : حاشای لیێ بکەم، نە ئەو کوڕی منە و نە من، باوکی ).

به گەیشتنی هەواڵی کوژرانی (مازن)، بێ ئەوەی رەهێڵـەی خـوڕە بارانێکی بەهاری بە چاوا بێتە خوار.. بێدەنگیەکی کڕ، باڵی بەسەردا کێشا.. بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وتی :((هیچ سووم لەوە نابێتەوە کە کوژراوە.. سووم لەوە دەبێتەوە، خەڵکی دەڵێن کوڕی حەمەلاوە)).

(خەجیج) بەو هەواڵـە، بـە دەمـی گـیراوەوە دەسـتی بـۆ ئاسمـان هەڵبڕی، وەك ئەوەی شـوکرانەی خـوا بکـات بـۆ ئـەو دەردو بەلاّیـەی مازن تووشـی هـات.. (حەمـەلاو) چـووە سـەر تـەرمەکـەی.. هـەردوو چـاوی پـڕ بـوو بـوون لـە فرمێسـك و چـەند تنـۆکێکی لیێ داچـۆڕایە خوارەوە بۆ سەر زەویەکە.. دەستە سڕەکەی بەر پشـتی دەرهێنـا.. چـاوە فرمێسـکاویەکەی پـیێ سـڕی.. جگەرەیـەکی ئـاگرداو بـە دەم هەڵڕوانینەوە، لە دەروونەوە وتی:((هەقە زۆر بۆخۆم بگریم، لە کاتێك من چ ڕێبازێکم هەڵبژاردووە و ئەو کوڕەشـم، بـەو رێبـازو بـەو رێیـەدا بچیێ)).

دوای ناشتنی تەرمەکەی، لەبەر لۆمەو لۆمـەکاری خـەڵك نەبوایـە، تازیەی بۆ دانەدەنا.

(ئامانج) لاوێکی تابلێ ی شۆخ و شەنگ.. باڵایەکی مام ناوەندی.. لووتێکی ڕێك.. دەم و لێوێکی کەمێك ئەستوور.. چاوو برۆ و سمێڵی ڕەشی قەترانی.. دوو ڕوومەتی گووپن و چەناگەیەکی خڕ.. ناوچەوانێکی ساف، لەشێکی پتەوی بە خۆوەی دوور لە ورگن و قەڵەوی هەبوو.

(حەمەلاو) قیت و قنج، چوار مەشقی دانیشتبوو.. شانی دادابوە سەر پەنجەرە کراوەکە و جگەرەیەکی داگیرساند.. دووکەڵی یەکەم مژی بە هەوادادا.. دوو کەڵی جگەرەکەی وەکو گەردەلوول، لە دەم و لووتی دەهاتە دەرەوە و هەندێکی لە ناو مووو وسمێڵە ئەستوورە سپیەکەی پەنگی دەخواردەوە و بە چەشنی هەڵم، لەناو کون و قوژبنی هەڵدەستا.. کەمێ لاڕانی هەڵکڕاند و رووی دەمی ئاڕاستەی (ئامانج) کرد :((کوڕم ئامانج، بەڕاستی لەو هاتوچۆیە بەردەوامەی تۆ بۆ شار، دەترسم کەتنێنکت لە بن سەربێ... ئامۆژگاریت دەکەم ئاگات لە خۆبێ و بە دوای کلاوی بابردو نەکەوی)).

**********

(ئامانج) بۆی لوا، سەری لە منەززەمەدا بەو پەڕی لە خۆبردووییەوە، وتی:((هاتووم خوێنی ئەو برایەم بە فیڕۆ نەدەم.. بۆیە دەمەوێ لەسەر هەمان ڕێباز، خزمەتی ئەو حزبە بکەم )).

مولازم (جەلعوت) بە پێکەنینەوە:((بێ شك.. بێ شك.. هیچ گومانم لەوە دانیە، دەتوانی جێ ی ڕەفیق (مازن) بگریەوە و نەهێڵی

شوێنەکەی چۆڵبێ.. ئێمە کارێکی زۆر گرنگمان لەبەر دەستە،بە بە جێگەیاندنی، چ جای بەخشینی هەمان پلەو پایە، بەخششێکی بێئەندازەت پێدەدەین)).

(ئامانج) بە واقورمانەوە :(شتی وەك چی؟!).

+ رەفیق (سوبحی) دەناسی؟!

- دوور بە دوور.

+ تا لە ناو یاخیبووان، متمانەت پێ بکەن، دەبێ قوربانی بە خۆ بدەین.

- چۆن تێ ناگەم؟!.

+ ئێمە رێو شوێنی کوشتنی رەفیق (سوبحی)ت بۆ خۆش دەکەین.. لەگەڵ دەرچوون لەو رێیە و چوونە دەرەوە.. تاوەکو بڕوات پێبهێنن.. جیهازی بێتەلمان هەیە.. هێمای پەیوەندی کردن بەیەکەوە دیاری دەکەین.. ئیشت تەنها ئەوەیە کەی پێویست بوو، زانیاریمان بۆ بنێری.. دوای ساڵێك تا دوو ساڵ، رێڕەسمی گەڕانەوەت بۆ فەراهەم دەکەین. بەمەش سەرجەم ئارەزووەکانت دێتە دی. دەبێ پارێزگاری لەم نهێنیە بکەی.. ئێستاش تا دوو ڕۆژیتر، لە بیرکردنەوە ئازاد بە.. مێشکت سافکەو وەڵامم بدەوە.

تەماحگیری و لەزەتی خۆ دەوڵەمەندکردن و وەرگرتنی پلەو پایە، لە کەللەی سەری (ئامانج) دەدا، کە دەم دەست بڵێ:((جا قوربان بەڕای ئێوە، خزمەتکردن پێویستی بە بیرکردنەوە هەیە؟! لە ئێستاوە ئەوەی ئێوە دەیلێن : ئامادەم، هەر هەمووی جێ بە جێ بکەم)).

**********

دوای دوو هەفتە و نەگەڕانەوەی (ئامانج)، ماڵەوەی بە جووڵە خست.. (حەمەلاو) ئۆقرەی نەما.. حەوسەڵەو حەوانەوەی لێ هەڵگیراو چاوی هەر لەبەر دەرگا بوو، (ئامانج) بێتەوە.

(خەجیج) شڵەژا.. خۆی دەهێناو دەبرد.. زامی دەروونی بە هەناسەیەکی سارد دەبرژا.. بە ئیشارەتدان :((کوا ئامانج؟! ئەو کوڕیژگەمان قەت وا دوانەکەوتووە.. دڵم ختوورەی ئەوە دەکات، شتێکی لێ قەومابێ )).

ئەویش نەیتوانی لەوە زیاتر بەرگەی ئەو چاوەڕوانیە بگرێ.. خۆی گۆڕی.. لە ماڵەوە دەرچوو.. بە لای ڕاست وەرچەرخاو گەیشتە جادەی سەرەکی، کە لە گوندەکەیانەوە دوو کیلۆ مەتر دوور بوو.. دەستی لەبەریەك لەو سەیارانە راگرت، کە بەبەردەمیدا تێ دەپەڕین.. بە مالأن وەربوو.. بۆ سۆراغ و هەواڵ پرسین، ئەوەی خزم و ناسیاوە، بەسەری کردەوە.. لایدایە ماڵی ئەو وەستایەی هەمیشە ئامانج وەکو شاگردێك، لەبەر دەستی دا قایەو گەچی دەگرتەوە.. پێی وت: (زۆربەی ئێواران، یەکمان دەدی. تەنانەت لە دوا دیدەنی دا، پێم وت: (سبەی ئیشمان هەیە، خۆت حازرکە). بەوەندە وەڵامی دامەوە وتی: (ئیشێکی زۆر لەوە گەورەترم لەبەر دەستە و سەرکەوتن تیایدا، پلەو پایە و دوا ڕۆژێکی پڕشنگدارم بۆ مسۆگەر دەکا ). لێم پرسی :(تۆیەکی شاگرد.. تۆیەکی کرێکار.. مەبەستت لە کامە دوا ڕۆژ و پلەو پایەیە؟! خۆ نەبویتە

وەستا؟!)بەزەردەخەنەیەکەوە، وتی (شتەکان زۆر گەورەترن لەوەی بتوانم، تەنانەت لای دایك و باوکیشم باسی لێوە بکەم)).

(حەمەلاو) داچڵەکی.. تەزوێکی بەلەش داگەڕا، ئەوەی بە دڵداهات :((هەبێ و نەبێ ئەو کوڕەی من، کەتنێکی کردیە؟! کێ دەڵێ ئێستا لە بەندیخانە، پلی نەداوەتەوە؟! کێ دەڵێ: ئێستا لە دەست یاسا خۆی حەشار نەداوە؟! کێ دەڵێ شەڕێکی مەزنی بۆ دروست نەکردووم؟! وا چاکە ئەو شوێنانە، بەنەخۆشخانە و بنکەکانی پۆلیس، هەموویان سەحکەمەوە)).

**********

کە شوێن و جێگەیەك، نەما.. کە کون و کەلەبەرێك نەما سەری پێدانەگرێ و بێ ئومێد بوو لە دۆزینەوەی سەرەداوێ.. یەکسەر چووە لای مولازم (جەلعوت) :((قوربان، من باوکی شەهید مازنم)).

ئەویش بە ڕوویەکی گەشەوە:((باوکی شەهید ڕێزی هەیە.. یاخوا بەخێربێی.. فەرموو.. فەرموو دانیشە.. لە کاتێکی باش هاتی.. خەریکە بڵێم: لە ئاسمانا بەدواتا دەگەڕاین، لە عەردیمان دەست کەوتی)).

(حەمەلاو) بە بزەیەکی دەستکردەوە:((ئامانجی خورامت، دوو هەفتەیە بە نامەی کرێکاری هاتۆتە شار، کەچی ئەوەی هەواڵە، دەربارەی نازانین.. دوا شت.. یەك :(خوا).. دووەم (تۆ).. هانام هێناوەتە بەر جەنابتان، هەوڵێ هیمەتێ بکەن لە دۆزینەوەی چارەنووسی ئەو کورەم، کە ئێستا تاقانەی ماڵێیە)).

مـولازم (جـەلعوت) زەردەیێکـی هـاتێ :((جـا ئـەوە مشەوەشـی دەوێ؟! لێرەوە دڵنیات دەکەمـەوە، کوڕەکـەت سـاغ و سـەلامەتە و ئەوەی عەیبە نیەتی.. بێگومان حەزدەکەی سەری لێ بدەی، ئەگـەر لێرەش نەبێ؟! وانیە؟!)).

(حەمەلاو) چەند ساتێ، چاوی هێمنی لێکنا.. لە دڵەوە :((بـەواتا: ئامـــانجی کـــوڕم لای ئەوانـــە.. دەســـت بەســـەرە)). کـــە چـــاوی کردەوە:((بەڵێ.. لەهەر کوێیەکبێ)).

+ باشە وەك ئەمانەتێك کە بەرپرسێتی تێدایە.. کوڕەکەی تـۆ لـە دەڤـــەری چـــیای قەنـــدیل، لـــە لای ســـەیدحیتۆ، چـــەکدارە.. پـــێش دەرچـوون و قوتـاربوون، جێهـازێکی بێتـەلمان داوەتـێ. هێشـتا تـۆ نـەهاتبووی، بـە دە دەقـە قسـەمان لەگـەڵ یەکـدی کـرد.. وێـڕای پێڕاگەیانـدنی هەنـدێ زانیـاری بەسـوود لەسـەر پێشـمەرگە.. پـاتری جیهازەکەی کز بووە، پێویستی بە چەند دانەیەکی تازەیە)).

ئـــەو قســـانە بـــۆ (حەمـــەلاو)، وەك خەنجـــەرێك وابـــوو ئاخنرایـــە جـەرگی.. ئارەقـەی پـێ کـرد.. بینـایی تاریـك داهـات.. تارماییـەکی هۆشی، بەیەکا هەڵزانان و لەژ ێر کەلەکەی دڕك و داڵی خەمەکانی دا، خونچەی خەندەیەکی گاڵتە جاڕی پەڕیە سەر لێو:((ئـەوها؟! یـەعنی ئێستا کوڕەکەی من، بوەتە پیاو؟!)).

مولازم (جەلعوت) دایە قاقای پێکەنین :((پیاوێك، نەوعی نـەبێ)). کە دەستی بۆ چەکمەجەی مێزەکەی بـەردەمی درێـژ کـرد:((فـەرموو ئەو پاتریانە و ئەو بڕە پارەیەی بۆ ببە)).

(حەمـــەلاو) وەك زمـانی لـە کلیلـە چـووبێ.. نـوتقی گـیرا.. بـە هەناسەی ساردەوە، شانەکانی هەڵتەکاندو بە دەسـتە لەرزۆکەکـەی، شتەکانی لێ وەرگرت. ئەوجا بەکزی و مات و مەلوولیـەوە ژوورەکـەی جێهیشت.. هـەنگاوی کـەنفتی بـە گـران بـەرەو گـەراج بـرد، دەتـوت تەرمێك بەسەر شانیەوەیە.. مێشکی دەکـولاو ناوچـەوانی بروسـکەی دەدا.. گێژوویـژ.. سەرسـام، دەسـتی بەیەکـداماڵین ونەیـدەزانی، چ بڵێ؟! چیبکا؟!. تا گەیشتەوە مـاڵ، هـەر بـەو داڵغـەوە، خـەربکما. خۆر: بەرەو خۆرئـاوا لارببـۆوە.. رق و کینـە لـە دەروونـی دا قـوڵپی دەدا، ئەوەنـدی کـەم بـوو وەکـو فرمێسـك لـە چـاویەوە بـڕژێ.. لـە ناوەڕاسـتی حەوشــە، پـاتری و پارەکـەی، نیشـانی (خــەجیج) داو رایدەتەکانـد:((بنـۆڕێ.. بنـۆڕێ.. ئـافرەت گـوێبگرە، ئـەو کـوڕە خوێڕیـەشمان بـۆ سـیخوڕی حوکمـەت و بـە بڕیـارو فـەرمانی ئـەوان، بوەتە پێشمەرگە)).

(خـــەجیج) پڕتـــاو، وەك شـــوژنێکی پیـــابکرێ، ڕاپـــەڕی.. بـــە حەپەساویەوە، پەنجەی خستە دەمی و لێلایـی چـاوی تێبڕی، ورتـە ورتێکی لێوە هات و بۆ سەرەوە هەڵکشا.

(حەمەلاو) بە چەپۆکان لەسەری خـۆی دەدا:((وەیـش لـە دەسـت ئەولادی خراپ.. وەیش لە دەست منـاڵی زۆڵ و بـەد فیسـاڵ.. چـارم نیە.. سبەی بگەمە لای.. مناڵمان گـەورەکردو لێبوینـەوە، بەڕلسـتی چاکەی باوکی دایەوە و ڕێ ی باوکی بە پیاوانە هەڵبژارد )).

لە حەشمەتان ئـەو ئێوارەیـە، نـانی نـەخوارد.. کـات: لـە نیـوەی شەوی تێپەڕاند بوو.. ئەو هەر بێدارە.. نەنووست.. سـەراپای تینـوو

توانای مێشکی بەم باسەوە تێکئالأند.. پرسیار لە دوو پرسیاری لە بارەوە دەکرد.. هەستی کرد ئەوە تارماییەك، خەریکە بەسەر پەنجەرەکە دادێ.. کە سەری هەڵبڕی، رووانی ئەوە مانگ لەوە دایە هەڵکشێتە ژوورەوە.. سەری نارەزایی بادا.

**********

گزنگی بەیانی دا.. خەریکی لەبەرکردنی ئەو جلانە بوو، کە قۆڵکێشی لەگەڵ لەبەر دەکردن.. سواری جێبێکی رەنگ خاکی بوو، جێبەکە بەلاکە لاك وەك مەڕەکەتره دەرۆیشت و رەشماڵەکەی سەری دەپێچاوە.. گەرد و تۆز و خۆڵی هەڵدەمژی.. بەرەو چیای قەندیل، لە کەناری رێچکەی خۆڵەکە دابەزی.. تۆزو خۆڵ، بەسەر ڕوومەت و بەرگیانی قەتماغەی، چزەی لە لەشی بڵند کرد بەدەم رێگاوە، نقومی دەریای خەیاڵ بوو بوو:((کوڕی خراپ گونی قوڕە.. دەیبڕی، ناکرێ.. نایبڕێ، هەرناکرێ.. توخوا ئامانج : خێرت گەیشتێ بەو تەمەنە، ئەو ئەزیەت و ماندووبوونەت خستەبەرم؟! بۆ وام لێدەکەی؟! بۆۆۆ؟!)).

ناوچەیەکی سەخت و دژوار و شاخاوی بڕی.. لە ناکاو گەنجێك، لە کەمینێکەوە بە دەنگێکی منالأنە، لێی راخوڕی :((هۆی کابرا نەجوڵێی)).

(حەمەلاو) خۆی شێلو نەکرد:((من حەمەلاوم ناوە.. ئەی تۆ کێی؟!)).

(ئامانج) دەستی نایە بەر ئەژنۆکانی و راست بۆوە.. رەنگی پەڕی.. لە باوکی هاتە پێش :((بابە گیان ئەوە تۆی؟!)).

چەکەکەی خستە سەرشانی و باوەشی بە باوکی دا کردو ئەملاو ئەولای روومەتی ماچ کرد :((یاخوا بەخێربێی، بابە.. بەڕاستی غەریبیم دەکردن.. توخوا دایکم چۆنە؟! ئەحوالّی؟! لەچیدان؟!)).

(حەمەلاو) موورەی لێکرد:((شوکر زۆر باشە.. ئەریّ کوڕم : ئەوە چی تۆی گەیاندە ئێرە؟!)).

(ئامانج) بە شپرزەییەوە:((بابە گیان ئەم ولاّتە پێوستی بە ڕزگار بوونەو مرۆڤی گیانفیدای گەرەکە ستەمەکانی تێدا بسڕێتەوە )).

(حەمەلاو) بە توانجەوە:((بەڕاستی کوڕی باوکی خۆتی؟! هیچت لیّ لانەداوە.. کوڕم ئامانج: پەیمان و بەلّێنمان چی بوو؟! بڕیارمان چۆندا؟! ئەی ئامۆژگاریەکان، بوون بە پووش و پەراش و بە هەواداچوون؟!توخوا نەمووت: دەم لە سیاسەت مەدە؟!)).

(ئامانج) بەدەم بزەیەکی کراوە:((وابزانم ئەو سیاسەتەی من هەلّمبژاردوە، تۆ چواردە سالّ، بیّ پسانەوە، خەباتت تێدا کرد.. سەید حیتۆ بەرپرسمانەو تۆ باش دەناسیّ.. هەمیشە پێم دەلّیّ :((تۆ ئەگەر بە باوکی خۆت بچی، هەرگیز هەلّە ناکەی، بۆیە پشتم بە تۆ ئەستوورە)).

+ ئێستا دلّنیا بم، کە تۆ خیانەت ناکەی؟!.

- دلّنیابە.

+ خۆزگە کوڕی من نەدەبووی.. خۆزگە هەردوو چاوم کوێربایە، بەس ئەو ناپاکیەتم نەبینیایە.

- باوکە گیان بۆ؟! بۆ وا دەلّیّ ی؟! کوردایەتی، پێشمەرگایەتی ناپاکیە؟!.

(حەمـــەلاو) دەســـتی کـــردە باخـــەڵی و پـــارەو پاترییـــەکانی، دەرێنا:((فەرموو ئەمەیە پێشمەرگایەتی تۆ.. ئەمەیە کوردایەتی تۆ.. ئـەو شـتانە مـولازم جـەلعوت بـۆی نـاردووی، هـەی سەگشـیری بـێ نامووس)).

تاگرتی، شەقازیلەیەکی خەواندێ :((لـەو لـەحزەوە، حاشـا،نە تـۆ کوڕی منی و نەمن باوکتم))... بۆ خوارەوە دابەزی.. ئەویش بەپەلـە جیهـازە بەسـتراوەکەی بـەر ڕانـی کـردەوەو پاتریـەکانی لێـدەرکردو پاتریە تازەکانی خستەسەر.. کەوتە قسە((ئەلۆ ٢٠٧ شەربەت (٢٠٧) شەربەت.. ئەوە ئیش بوو ئێوە کردتان.. ملی خۆم بشکاندایە، لـەوە چاکتر بوو ئەو شتانەتان بە باوکما نارد)).

(سـەید حیتـۆ) کـە لـە نـاو جێبەشـڕەیەك، ڕووەو دارسـتانە چـڕو جەنگەڵیەکـە دەڕۆیشـت، بـە بینینـی (حەمـەلاو) رایـدەگرێ و دێتـە خوارێ.. کەوتنە تەوقەو چاك و چۆنی و ماچـکردنی ئـەملاو ئـەولای یەکـدی:((یـاخوا بـە خێربێـی، سەرچـاوان.. دەفـەرموو بابچـینە لای ئێمە، نیوەڕۆ خزمەتتکەین؟!)).

+ هەر ئاوەدان و ئێوەش سەرفراز بن.. دەبێ بچمەوە.

– کاکە حەمەلاو، من بە ئامانجی کوڕت، شادو خۆشحاڵم.

+ بەسەر سوڕمانەوە :((باشە کاکە سەید وایلێهاتوە ئەوەی هاتـە ئێرە، یەکسەر وەریدەگرن؟!)).

– ئەگەر مەبەستت ئامانجە، ئـەوە هـەموو حیسـابێکمان لەبـەر تۆ، بۆی بەجێهێشتووە:

+ئـاخر ئەمـە، بۆچـوونێکی هەڵەیـە.. پێوانـەی شـتەکان : نـابێ لەسەر ئەو بناغەیە بێ کەفلان چونکە کوڕی منە، ئیتر تەواو، هـەموو متمانەێکی پێبدەن.

- نازانم : جگە لە (ئامانج) کوری باوکی خۆیەتی.. نـازانم دوای کوشتنی ڕەفیق حزبیەك، چ گومانێکی لەسەر دروستکەین؟!.

+ باشــە پرســیارێکم هەیــە.. لــەم ماوانــە دا هەســتان بــە هــیچ مەترسیەك نەکردووە؟١.

- تەنها ترسی ئەوەیە، ئێمە لە پەڕینەوە.. لـە شـوێنێکەوە بـۆ شوێنێکی تر، وەك فڕۆکەکانی ڕژێـم تـاو بـە تـاو چـاودێریمان بکـەن، دەم و دەست دەزانن وا ئێمە لەسەر پەڕینـەوەین، دەزانـن ئـەوە بـە نیازین هێرشیان بکەینە سەر فڕۆکەکان دەکەوێتە لێدانمان.

+ ئامۆژگارییەکی بچووك، بۆ بـرای خـۆم.. پـێش ڕۆیشـتنم، حـەز دەکەم بزانی لەنێو ئێوەدا دەستێکی تێکـدەر هەیـە.. پێویسـتە ئـەو دەستە ببڕدرێ.. پێم چاکە هەر دوای مـن، لـە خۆتـەوە دەسـت پـێ بکەی، بلێ ی: هەست دەکەین دەستێکی چەپەڵ لـە ناومـان ڕواوە.. من لە خۆمـەوە دەسـت پێدەکـەم، خـۆم ڕووت دەکەمـەوە.. ئـەوجا ئێوە، بە بێ عێـدز بـوون دەبـێ یەکـە یەکـە، خۆتـان رووتکەنـەوە.. ئەوجا هەر کەسێك دەرچوو، گەر کوڕی من بوو، رەحمی پێمەکەن.

- بەڕاستی کورد، مرۆڤی باوەڕ پتەوی وەك تۆی هەبێت، دوژمن هەزار هەزار هێندە بە هێزبێ، ناتوانێت بمانشکێنی.. ئیشـاللاَ ڕۆژێـك دادێ ئـەو رژێمـە بڕوخـێ و خـۆری ئـازادی لـە کوردسـتان هـەڵبێ..

ئێستاش لەبەر گەرمی رۆژەکە، با زیاتر راتنەگرم، مادم نامێنیـەوە.. فەرموو سواربە، بانەختێ لە جادەی سەرەکیت، نزیك بکەینەوە.

+ سوپاس بۆ ئەو هەستە ناسکەت.

- هیچ سوپاسێکی پێناوێ.

**********

کاتێ گەڕاوە.. خۆرەتاوەکە بـە رووکـاری راسـتی ماڵـەکان، زەرد چـۆوە.. بـاڕە و بـۆڕەی مێگەلـەکانی ئـاوایی، خۆشـیەکی پیرۆزیـان رژانـدە ناخیـەوە.. ئـەوەی بینـی و بیسـتی، هـەمووی بـۆ جـەخیج گێڕایەوە.

(خەجیج) ما، خەم بخواو لە بەرەوە پشی بخواتەوە و دڵی پڕبـێ. دوای دوو ڕۆژ.. بەیانیەکیان، مەفرەزەیەکی ئەمن، هەڵیکوتایـە مـاڵی (حەمەلاو) و بە قۆنداغە تفەنگ، وەرگەڕانە سەری :((گەواد.. خیانەت لە حزب دەکەی؟! وا دەزانی نازانین چۆن ئەو کوڕەت بە گـرت دا؟! بۆیە لە ئێستا زووتر نیە، کە ژیانی تۆش بە کۆتا بێ و بکوژرێ ی)).

خوێن لە دەم و چاوی دا فیچقەی کـرد.. پێشـیان دا.. (خـەجیج) هەرچەندی دەمی بەش بۆوە هاوار بکا.. دەنگی دەرنەچـوو.. کـت و پڕ، جەڵتەی لێدا.. بەربۆوە.. بە چـاوی پـڕ فرمێسـکەوە کەوتەسـەر زەویەکـە.. نووچـیدا هـەنگاونان، بگاتـە لایـان.. بپارێتـەوە، نـەهێڵێ (حەمـەلاو) ببـەن.. وەلێ ئەفسـووس لـە ناوەڕاسـتی حەوشـە، لرخـە لرخێکی لێوە هات و گیانی دەرچوو.

ئەو ڕۆژە بوو بە خۆڵبارانێك، بە خەمناکی دادەباراند و بینە قاقای هەموو شتێکی ئەو ناوەی گرتبوو.. خەڵکەکە لە ماڵـەوە دەرنەچـوو،

